# پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

# لەدڵی هاوەڵانیدا


نوسینی

ولیدالاعظمي

وەرگێڕانی و ئامادەکردنی

بەکر حەمە صدیق عارف



چاپی سێیەم

٢٠١٣

# پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)
# لە دڵی هاوەڵانیدا

نووسینی

ولید الاعظمي

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

بەکر حەمە صدیق عارف

چاپی سێیەم

٢٠١٣

بسم الله الرحمن الرحيم


- **ناوی کتێب:** پێغەمبەر ﷺ لەدڵی هاوەڵانیدا
- **نـوسینـی:** ولیدالاعظمي
- **وەرگێڕانی و ئامادەکردنی:** بەکر حەمە صدیق عارف
- **دیزاینی ناوەڕۆك و بەرگ:** محمد معروف
- **نۆرەی چاپ:** سێیەم ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ عدد

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەگشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٨٦٦)ی ساڵی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ

**لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر**

## پێشەکی وەرگێڕ:

لە مانگی رەمەزانی ساڵی (١٤١٨ك – ١٩٩٨ز )دا کاتێك بە خزمەت ئەم کتێبە بەڕێزە گەیشتم ، پێشتریش لە خزمەتیدا بووبووین، بەڵام دەرفەت نەڕەخسابوو بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زاری کوردی شیرین، ئەوەش خولیای سەرم بوو، بۆ هەلێك دەگەڕام تا ئەو دەرفەتەم بۆ بڕەخسێ، ئەوە بوو بەمەبەستی ئامادەکردنی بەرنامەیەکی گونجاو پشت بەخوا دەستم دایە وەرگێڕانی کتێبەکەو بە (٤٣) دیداری تەواو وەرم گێڕایە سەر زمانی کوردی. بێگومان ئەم نووسراوە گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لە پەروەردەی کردەیی رۆڵەکانی ئیسلامدا بەو شێوازو تەرزە مەحکەمەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی هاوەڵانی چەسپاندبووی، پاشانیش قسەکردن لەسەر تاعەت و شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ خۆشەویستی ئەو زاتە هیچ مانایەکی نییە، ئەم کتێبەش چارەسەری ئەو حاڵەتە دەکات و چەند هەڵوێستێکی گرنگ و پرشنگدار لە هەستی ناسکی هاوەڵان هەڵدەبژێرێ‌و دەیکاتە مەرجێکی کردارەکی بۆ حاصڵ کردنی خۆشەویستی خواو رازی بوونی لە هەموو بەندەکانی خۆی. (قل إن كنتم تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله ويغفر لكم ذنوبكم...).

ئەوەش دەڵێم کە لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا سێ تێبینی دەخەمە خزمەتی خوێنەری بەڕێزو ئومێدەوارم رەچاوی بکات:

١) بە پێویستم نەزانی هەموو هەڵوێست و رووداوەکان وەرگێڕم، چونکە زۆریان لە کتێبی تردا باسیان لێوەکراوەو خوێنەری کورد پێیان ئاشنایە، لە لایەکی تریشەوە بە گونجاوم نەزانی کە لە پاڵ رووداوەکانی تردا ریزیان بکەم، چونکە شێوازی چارەسەریان جیایەو لە مەبەستی سەرەکی باسەکە دوور دەکەوێتەوە.

٢) نووسەر لە پەراوێزی باسەکاندا ئەو سەرچاوانەی نووسیوە کە باسەکەی لێوەرکرتوون، من لەوەرگێڕانەکەمدا سەرچاوەی پەراوێزەکانم واز لێهێناوەو تەنها لە کۆتاییدا ئاماژەمان کردووە بۆ ئەو سەرچاوانەی نووسەر پشتی پێبەستوون لە باسەکەیدا.

٣) ناوی سەرباسی هەندێك لە باسەکانمان گۆڕیوە لەبەر پێویست.

لە کۆتاییدا ئومێدەوارم خوای گەورە لە ئێمەشی قبوولْ بکات و هەموو خوێنەرێکیش لە نزای خێر بێبەشمان نەکات.

بەکر حەمەصدیق عارف

## پێشەکی نووسەر

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه الأطهار الأبرار وعلى من دعى بدعوته واقتدى بسنته إلى يوم القيامة.

یەکێك لە نیعمەتەکانی خوا بە سەر ئێمەی مسوڵمانەوە ئەوەیە کە لەسەر حاڵتێك دروستی کردووین پێغەمبەری خوامان خۆش بووێت (ﷺ) کەسێتی و رەوشت و سیرەت و بانگەوازەکەیمان لە لا خۆشەویست بێت، کە پێگەیشتن ئەو خۆشە ویستییەش لەناخ و هەست و هۆشماندا گەشەی کردووەو گەورە بوو.

گومان لەوەدا نییە دڵسۆزی و راستگۆیی شێخ و مامۆستایانی ئەو کاتە شیرینی و جوانییەکی بەخشی بوو بە قسەکانیان و ناخ و گوێمان دەهەژاندو دڵەکانمانی پڕ دەکرد لە خۆشەویستی، کە بەداخەوە لە رۆژگارەکانی ئەمڕۆدا هەستی پێناکەین، چونکە هەرچی لە دڵەوە دەرچوو دڵان دەسمێت.

ئێمە گەورە بووین لەگەڵ گەورەبوونی خۆماندا خۆشەویستییەکەمان گەورەتر بوو، کەوتینە خوێندنەوە، بە خوێندنەوەی چەند کتێبی فیقهو زمان و مێژوو ئەدەب، لە ناویاندا وابەستەی باسە قەشەنگەکانی سیرەت بووین، دەمان خوێندەوەو تام و چێژی تایبەتمان لێ وەردەگرتن.

هەڵوێستی بەرزی هاوەڵان دەیهەژاندین، لەو هەڵوێستانەدا کە هاوەڵان دەیان ویست تەعبیر لەسەر خۆشەویستی خۆیان بدەن و بۆ پێغەمبەری مەزن (ﷺ)و لە پێناویدا ماندوویەتیان نەدەناسی و چەندیان لە پێناوی خوادا دەبەخشی و لە بەردەستی پێغەمبەردا گیانیان دەردەچوو.

کاتێك کە منداڵ بووین ئەم باسانەیان بۆ دەکردین، ئاواتمان دەخواست لەسەردەمی پێغەمبەردا بووینایە تا گوێمان لە دەنگی پیرۆزو چاومان لە رەنگی جوانی بوایەو لە دوایەوە نوێژمان بکردایەو پەیمانمان بدایە کە سەربازی گوێڕایەڵو ملکەچ بووینایە.

هەموو ئەوانە وەك خەونێكی خۆش هاوڕازمان دەبوون، هەمیشە گوڕو تینمان پێدەبەخشین و هەستی ئایینیمان بەرز دەبووەوەو كڵپەی لە باوەڕمان هەڵدەستاندو ویژدانمانی دەجولاند.

لەو ماوەیەدا بڕێكی زیاترمان لە كتێبی سیرەمان دەخوێندەوەو كۆڕو كۆبوونەوەكانی خۆمانمان پێ گەرم دەكرد، بە تایبەتی زستانان شەوچەرەی شەوە درێژەكانمان بوو، بە منداڵی دەم خوێندەوەو ئەمڕۆش كە پیر بووین زیاتر تامەزرۆی خوێندنەوەیانین هەتا وامان لێهات بەشێكی زۆرمان لە سیرەتی پێغەمبەرمان لەبەركردو ناوی زۆربەی شوێن و كاتی ڕووداوەكانی سیرەتی پێغەمبەرمان لەبەركردو ناوی زۆربەی شوێن و كاتی ڕووداوەكانی سیرە لە هەست و بیری هەمووماندا جێگیربوو بوو، بە شێوەیەك خولیامان بوو كە ڕۆژێك لە ڕۆژان زیارەتی هەردوو  حەرەمی شەریف بكەین و لە یادەوەری ڕۆژانی پێغەمبەری مەزندا یادێكی ئەو جێگاو مەقامانە بكەینەوە كە شانۆی ڕووداوەكان بوون، لە ناخی دڵەوە نزامان لای خوا دەكرد ئەو ئاواتەمان بێنێتەدی و ئەو شوێنە دڵگیرانە ببینین.

قەدەری خوا وابو كە چەندجارێك حەجی ماڵی خوا بكەین، نەریتمان وابو كە پێش ئەوەی سەفەرەكان بكەین دەگەڕاینەوە سەر كتێبەكانی سیرەت و جەختمان لەسەر ئەو شوێنانە دەكردەوە كە ناویان لە كتێبەكانی سیرەدا هاتبوو، دەچووین زیارەتمان دەكردوو بیرەوەرییەكانی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانمان دەهێنایەوە یادو دڵمان دادەمركایەوە، لە مزگەوتی حەرام منیش بۆی دادەنیشتم و تیلە نیگایەكی قووڵم لە كابەی شەریف دەداو بیرم لەوە دەكردەوە كە ڕۆژانی پێغەمبەر (ﷺ) بە چواردەوری كابەدا تەواف عومرەی قەزای دەكردو لە حەجی ماڵئاواییدا هاوەڵان قەرەباڵغییەكی زۆریان لە دەوری دەكردو ماریفەتیان لە حزووریدا دەنواند.

که بەناو کوچەو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەگەڕام، لەبەرخۆمەوە دەموت: تۆ بڵێی پێغەمبەر (ﷺ) بەم ڕێگاو بانەدا گوزەری نەکردبێت؟، پاشان دەگەڕامەوە ژوورەکەم. دەمخواست کە ئەو خاك و ئاوە زمان و هەستیان هەبووایەو وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە: ئایا کوڕی هاوەڵانیان دیوە کاتێك زیکرو یادی خوایان دەکردو قورئانیان دەخوێند؟، یان: ئایا ئازارو ئەندێشەو کۆت و زنجیرەکانیان کە لە مل و گەردنی هاوەڵان دەئاڵێنران؟، نازانم...

بەهەمان شێوە... ئەم خەیاڵو ئەندێشانەم لە شاری مەدینەش بۆ دروست دەبووەوە، لە ڕەوزەی پاك و خاوێن دادەنیشتم و سەیری میوانانی خانەو نوێژەکانم دەکرد، لە ڕووە گەشەکانیان ورد دەبوومەوەو خەیاڵ دیبردمەوە بۆ زەمەنێکی دوور، ئەو ساڵەی ناونرا ساڵی وەفدەکان، کە چۆن لە هەموو لایەکەوە وەفدی هەمەجۆر ڕوویان دەکردە شاری مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ).

ئای کە دیمەنێکی مەزنە، بە خەیاڵ ئەنصارییەکانم دەبینی پاسەوانی جێگەو ماڵەکانی پێغەمبەری خوایان دەکرد (ﷺ)، وادەبینم ئەهلی صەففە بە تەنیشت ماڵەکانەوە بە بەرگی هەژارییەوە وەستاوە، پایەکەی (ئەبولبابم) لە پێش چاوە کە چۆن خۆی پێوە بەستەوە هەتا خوا تۆبەکەی لێ قبووڵ کرد.

کە دەڕۆینە گۆڕەپانەکەی (ئوحود)، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژین، بەو ئومێدەی بای شەماڵێك لە بەهەشتی بەرینەوە بەرەو لامان هەڵکات، هەروەك چۆن بەسەر هاوەڵی خۆشەویست (ئەنەسی کوڕی نەزەر)دا هەڵی کردو لەگەڵ خۆیدا بۆ بەهەشتی برد.

بەڵێ بەسەرهاتەکەی بەدرو ئوحودو حونەین و جەعرانەو خەیبەرو تەبوك و... هەڵوێستی یاران لە مەککەو مەدینەدا قسەو باسی ئەو سەفەرەمان بوو.

لە کاتی خوێندنەوەمدا بۆ سیرە، چەند چەپکە گوڵێکی بۆنخۆشم لە و ڕووداوو هەڵوێستانە چنیەوە، هەرکاتێك دڵم ڕەق ببوویایە خێرا دەگەڕامـــەوە

سەر ئـەو بەسەرهاتانەو دەمەزەردی خۆمم پێ دەکردەوەو کە لێدەبوومەوە ئارامی و هێمنی باڵیان بەسەردا دەکێشام، بۆیە بە چاکم زانی هەواڵی ئەو هاوەڵە ئەستێرانە بە پێی یەك لەدوای یەکی زەمەنی لە ڕووداوەکانی سیرەدا ریزیان بکەم و بیان نووسمەوە.

لەسەرەتای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی (١٣٩٨ك) پاش گەڕانەوەم لە حەج، وەك نوقڵانەیەکی خۆش بۆ کۆچی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ)و بە پیرۆزی و بەرەکەتی ئەو یادەوە حەزم کرد سەرەتای دەستپێکردنی تەمەنی ئەم کارەم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بێت (ﷺ)و بەرزیو بڵندی ئەو زاتە مەزنە لە دڵی هاوەڵانیدا ببێتە هەوێنی رسکانی ئەم باسە. بۆیە لە کتێبێکدا شیاوترینیانم هەڵبژاردو ناوم لێنا (الرسول في قلوب أصحابه) (پێغەمبەری مەزن (ﷺ) لە دڵی هاوەڵانیدا)...

سەرباسەکانم لە ناوەڕۆکی رستەی ناو باسەکانەوە وەرگرتووە، یان هەڵبژاردەی خۆمن و لە شوێنی گونجاودا دامناون، لە پەراوێزی هەموو بابەتێکیشدا ئاماژەم بۆ ئەو سەرچاوانە کردووە کە باسەکەم لێوەرگرتووە.

لە خوا دەپارێمەوە کە بەم چەند لاپەڕەیە تووشی خێرم بکات و، سوودی هەبێت بۆ ئەو کەسەی دەیخوێنێتەوەو ئاگادارم بکات لەو هەڵانەی کە تێی کەوتووم. منیش هەر لە سەرەتاوە داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و دەپارێمەوە کارەکانمان تەنها بۆ خۆی بێت و لێمان قبووڵ بکات.. دوا وتەشمان سوپاس و ستایشە بۆ خوای جیهانەکان.

خۆشنووس (ولید الأعظمي)

بغداد/ ألأعظمية

سەرەتای موحەرڕەمی ١٣٩٨ی کۆچی

١١ی کانوونی یەکەی ١٩٧٧ی زایینی

دیداری یەکەم

## لەوە سەیرترە کە ئێوە حسابی بۆ دەکەن..

شوێن شاری مەکەیە... چەند ساڵێك دەبێت خوای مەزن موحەممەدی شەرەف مەند کردووە بە نازی پێغەمبەرێتی... کات... دوای گەڕانەوەی پێغەمبەرە لە گەشتی ئەو شەو ڕەوی‌و بڵندبوونەوە، پێغەمبەری خوا لە ناو (بيت الحرام)دا دانیشتووە... (أبو جهل) بەلایدا تێپەڕی کردو بە گاڵتە پێکردنێکەوە پێی وت:

– خەبەری تازە چییە؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەواڵی تازەم پێیە...

ئەبو جەهل وتی: ئەو هەواڵە تازەیە چییە؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەم شەو ، شەوڕەویم پێکرا بۆ (بيت المقدس).

ئەبو جەهل وتی: (بيت المقدس) چۆن شتی وا دەبێت؟، باشە ئەگەر ئێستا ئەو قەو م و قیلەت لە دەور کۆبکەمەوە دەتوانی ئەم قسەیە بکەیت؟.

پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ.. دەشتوانم و دەشیڵێم.

ئەبو جەهل.. ویستی هەرچی خەڵکی دەم پیس و هەرزەگۆی قوڕەیش هەیە لێی کۆبکاتەوەو بیکاتە گاڵتەجاڕی، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە هێمنی و لەسەر خۆ بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، هەواڵ و دەنگ و باس بە مەککەدا بڵاو بۆوە، بوو بە دەنگ و باس و موشریکەکان کردیانە مقۆ مقۆو ورتە ورت، هەندێکی تریشیان کردیانە فیك و فاك و گاڵتەجاڕی بۆ ئەوەی هەواڵەکە بە درۆ بخەنەوە.

ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوە: حەسەنی بەصری وتویەتی: دوای ئەو ڕووداوە خەڵکی بەهەڵەداوان ڕۆیشتنە لای (ئەبو بەکری صدیق)(ر.خ) بۆ ئەوەی گومانی بۆ دروست بکەن ئازاری دڵی بدەن، چوونە لای‌و وتیان: چی دەڵێی لەبارەی ئەو

سەفەرەوەکە موحەممەدی هاوەڵت باسی لێوە دەکات؟، ئەو دەڵێت: ئەمشەو چۆتە (بيت المقدس)و نوێژی تێدا کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ مەککە!.

ئەبو بەکر فەرمووی: ئێوە درۆی بەدەمەوە دەکەن.

وتیان: درۆ ناکەین، خۆی لەمزگەوتدایەو بۆ خەڵکی باس دەکات.

ئەبو بەکر فەرمووی: سوێند بێت بە خوای گەورە، ئەگەر موحەممەد (ﷺ) ئەوەی گوتبێت راست دەکات و منیش باوەڕی پێدەکەم! سوێند بێت بە خوا ئەو هەمیشە هەواڵم دەداتێ، کە خەبەری نیگای لە ئاسمانەوە بۆ دێتە سەر زەمین، من باوەڕ بەوەی دەکەم کە فەرموویەتی، ئەوەی منیش لەوەی ئەو سەیر ترە!.

پاشان ئەبو بەکر هەستاو بەرەو لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە رێ، هەتا گەیشتە خزمەتی و پێی فەرموو: پێغەمبەری خوا! ئایا بەڕێزت فەرمووتە: کە ئەمشەو گەیشتوویتە (بيت المقدس)و نوێژت تێدا کردووە؟.

پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.

ئەبوبەکر فەرمووی: پێغەمبەری خوا... بۆم باس بکە، چونکە من دیومە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە وەصفکردنی شێوەو رواڵەتی (بيت المقدس) بۆ ئەبو بەکرو هەر رستەیەکی تەواو دەکرد، ئەبوبەکر دەیفەرموو: راست دەفەرموویت، تا کۆتایی بە قسەکانی هێنا ئینجا ئەبوبەکر فەرمووی: پێغەمبەری خوا تۆ راست دەکەیت، شایەتی دەدەم بە هەق کە تۆ پێغەمبەری خوای... پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەبوبەکر بەراستی تۆش راستگۆو ئیمانداریێکی راستەقینەیت.

لەو کاتەوە ئەبوبەکر خەسڵەتی (صديق)ی پێوە لکاو ئەو شەرەفەی وەرگرت...

## دیداری دووەم

### بـەروح و گیـان فیدایی دەکات

پاش ئەوەی کە مسوڵمانان لە ناو شاری مەککەدا جێگایان لەبەر تەسك بۆوەو ئازارو ئەشکەنجەی موشریکان گەیشتە ئەو پەڕی، ئیتر خوای گەورە مۆڵەتی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمان بدات بە کۆچ رەو بۆ شاری (یثرب)... پاش ئەوەی کە هەموو ئیمانداران پۆل پۆل و بە شێوەیەکی نهێنی کۆچیانکرد... پێغەمبەری چیتر دڵنیا بوو کە هەموو هاوەڵانی کۆچیان کردووەو گەیشتوونەتە ناوچەی ئارامی و لە دەست موشریکانی مەککە رزگاریان بووە، ئینجا کاتی ئەوە هاتە پێشەوە کە خۆیو هاوەڵەشیرینەکەی (ئەبوبەکر)یش شار بەجێبهێڵن و بەرەو هەمان جێگەی مەبەست کۆچ بکەن، بەڵام دیارە کۆچکردنی ئەمان وەکو کۆچکردنی هەرکەسێکی تری ئاسایی نییەو موشریکانیش ئەمانیان بەسەری مەسەلەکە دەزانی، لەبەرئەوە بەوردی بەشوێنیاندا دەگەڕێن... کۆچکردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵی غاردا، لە کتێبەکانی سیرەدا بەوردی باسی لێوە کراوە، با ئێمەش لەگەڵ بەسەرهاتەکەدا تێکەڵاو ببین و بزانین سیرەتناسان دەربارەی ئەو دیمەنە مەزنە چی دەڵێن؟!

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی کۆچ بکات، تەشریفی هات بۆلای ئەبوبەکرو لە قرچەی نیوەڕۆیەکی گەرمداو لە کاتی نووستن پشوودانی موشریکاندا. بە هێمنی لە دەرگای ماڵی ئەبوبەکری دا، دەست بەجێ دەرگای لێکردەوەو حاڵی بوو کە خوای گەورە مۆڵەتی سەفەری پێداون و شەرەفی هاوڕێی ڕێگەی لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزدا پێ خەڵات کراوە، بۆیە پێکەوە چوونە کوخێکی بچووك کە ئەبوبەکر بۆ ئەو مەبەستە لە پشتی ماڵەکەیدا دروستی کردبوو، کەوتنە گفتوگۆو بڕیاریاندا بەرەو شاخێکی لای خوارووی شاری مەککە بکەونە ڕێ.

خۆیان هاویشته ناو ئەشکەوتێکی شاخەکە بەناوی (ثور)و لەوێدا ماوەیەك خۆیان حەشاردا، ئەبوبەکر عەبدوڵڵای کوڕی راسپارد کە گوێ قوڵاخی هەواڵەکانی قوڕەیشیان بۆ بکات و شەوبێتەوە ئاگاداریان بکات، هەروەها فەرمانی دا بە خزمەتکارەکەی بەناوی (عامری کوڕی فهیرە)بوو بەڕۆژ لەو ناوچەیەدا مەڕو ماڵاتەکەی بلەوەڕێنێت بۆ ئەوەی شوێنی هەردووکیان بسڕێتەوەو موشریکان نەیان دۆزنەوە.

خاتوو (ئەسما)ی کچی ئەبوبەکریش هەموو سەر لە ئێوارەیەك خۆراکی بۆ دەهێنان... لێرەدا تێبینی دەکەین، کە ئەبوبەکر بەخۆی‌و منداڵییەوە خەمی سەلامەتی پێغەمبەری خواو بانگەوازەکەیان لێنیشتووەو ئامادەی هەموو جۆرە قوربانییەکن، تەنها لە پێناوی ئەوەدا کە پێغەمبەری خوا ساغ و سەلامەت و سەرفرازبێ‌و تووشی هیچ زیانێك نەبێت.

شێخ حەسەنی بەصری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خواو ئەبوبەکر بەرەو ئەشکەوتی (ثور) رۆیشتن و شەو گەیشتنە ناو ئەشکەوتەکە، ئەبوبەکر پێش پێغەمبەر چووە ژوورەوە، دەستی هێنا بە دیوارە تاریك و زبرەکانی ئەشکەوتەکەدا نەبادا مار یان دوپشکێکی تێدا بێت و ئازاری پێغەمبەری خوا بدات.

ئێستاش با گوێبگرین بزانین ئەبو بەکری صدیق (رەزای خوای لێ بێت) چۆن ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە.

ئەبوبەکر دەڵێت: لە ئەشکەوتەکە هاتینە دەرەوە رزگارمان بوو، لەگەڵ قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا کەوتینە رێ، زیخ و چەوی رێگە، لمی بیابانەکە وەك پشکۆی ئاگر داگیرسابوون، لە هەموو لایەك هەڵمی گەرما لە چاو دەبووە تەراویکە، بە هەر چوارلادا سەیرێکم کرد تا بزانم کەس لە دوومان ناگەڕێت، هەرچەندە سەیری چواردەوری خۆمم کرد رەشاییم لە هیچ جێگەیەك نەدەبینی... کەمێك کەوتینە رێ، لە دوورەوە بەردێکم بەدیکرد، بەپەلە بەرەو

رووی بەردەکە چووین، هەتاکو سوود لە سێبەرەکەی وەربگرین. خێرا شوێنی سێبەرەکەم بە دەست چاك کرد بۆ پێغەمبەری خوا فەروەیەکم پێبوو بۆم راخست و کەمێك حەوایەوە، جارێکی تر خۆم کەوتمە گەڕان بەدەوری بەردەکەدا چاودێری ناوچەکەم دەکرد، نەك بەشوێنمانەوە بن.

ریوایەتەکانی سەرچاوەی سیرەتناسەکان باس لەوە دەکەن لەو سەفەرەدا ئەبوبەکر جارێك لە پێش پێغەمبەری خواوە دەڕۆیشت و جارێك لە پشتییەوە جارێکیش لە لاتەنیشتییەوە، کاتێك پێغەمبەری خوا پرسیاری لێکرد بۆ وا دەکەیت؟ ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە: دایك و باوکم بە فیدات بێت، کاتێك لەگەڵ بەڕێزت رێدەکەم بیر دەکەمەوە دوژمن بە شوێنمانەوە بێت و بیانەوێت ئازارت بدەن، دەڕۆمە دواوە بۆ ئەوەی ئەو ئازارە بەر من بکەوێت، وە کاتێك بیر دەکەمەوە دوژمن لە پێشمانەوە کەمینی بۆ داناوین، دەکەومە پێشەوە بۆ ئەوەی بەری لێبگرم و پێشوازی لە ئازارەکان بکەم.

پێغەمبەری خوا لەبەردەم ئەو دڵسۆزی و بەرخودانە... سوپاسی گەرمی ئەبوبەکری کردو نزای خێری بۆکرد.

لە شارۆچکە نازدارەکەی مەدینەش، بە پەرۆشەوە دەست لەسەر دڵ چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد، خەم دایگرتبوون، لەوە دەترسان شتێکی لێ بەسەر هاتبێت، (عبدالرحمن)ی کوڕی (عومیر) دەڵێ: هەندێك کەسی کە لەو کاتەدا چاوەڕوانیان دەکرد بۆی گێڕامەوەو دەڵێ: کاتێك بیستمان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککە دەرچووە، ئێمە چاوەڕوانیمان دەکرد بگاتە جێ و پێشوازی گەرمی لێبکەین. بەرەبەیان نوێژی بەیانیمان دەکردو دەچووینە دەرەوە هەتاکو نیوەڕۆ لە ژێر بنە دارخورماکاندا دەماینەوە، هەتاو ئەوەندە لێی گەرم دەکردین هەتا بێتاقەت دەبووین و سێبەری دارخورماکانیش کەم دەبۆوەو ئەو رۆژە بە ناچاری دەگەڕاینەوەماڵەوە، هەتا رۆژێکیان پاش ماندوو بوونێکی زۆر، تینی گەرما زۆری بۆ هێناین و سێبەرەکان کەم بوونەوە، بە ناچاری

گەڕاینەوە ماڵێ، یەکەم کەسێك پێغەمبەری خواو ئەبوبەکرو دەلیلەکەیانی بینی کابرایەکی جوولەکە بوو، هەر لەو دوورەوە هاواری کرد: خێڵی ئەوس و خەزرەج! خەڵکی شاری مەدینە! وەدەرکەون، ئەوە باپیرەتان گەیشتەجێ...

ئێمەش لە خۆشیدا بەپەلە هاتینە دەرەوە سەیرمان کرد تازە بەتازە گەیشتوون و پێش ئێمە هەندێکی تر گەیشتوونە لایان، کاتێك ئێمە گەیشتووینە خزمەتیان...

کەسیانمان نەدەناسی، نە ئەبوبەکر لە تەمەنی پێغەمبەری خوادا بوو، بۆیە زۆر کەسی تریش وەکو من کە کەسیانیان نە دیبوو نەیان دەزانی کامیان پێغەمبەری خوایە...

خەڵکی قەرەباڵغی و هەرایەکیان دروست کرد، لە تاو گەرماش بێ تاقەت دەبوو. ئەوان لە بن دارخورمایەکدا دانیشتبوون، هەتا سێبەرەکەی نەما، ئینجا ئەبوبەکر بۆئەوەی خەڵکی تێبگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا کامیانە تەشریفی هەستا کراسەکەی خۆی داکەندو کردی بە سێبەر بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئیتر خەڵکی پێغەمبەری خوایان ناسی و زانیان ئەوی تریان ئەبوبەکری هاوەڵیەتی کە لە خزمەتیدایە. لەم هەڵوێستە ناسکەی ئەبوبەکرا ئەدەبێکی زۆر جوان دەخوێنرێتەوە لەلایەن ئەبوبەکرەوە، نەبادا کەسێکی تر بەهەڵە لێی تێك بچێ‌و وابزانێت ئەبوبەکر پێغەمبەری خوایە... لەم سەفەرە پڕ لەمیحنەت و شەکەتییەدا، ئەبوبەکر بە دەقی کەلامی خوا لە قورئانە مەزنەکەیدا شەرەفی هاوەڵێتی سەفەری گەورەترین مرۆڤی وەرگرت و (إذهما في الغار) شایەتێکی قورئانی زۆر مەزنە بۆ گەورەیەتی ئەبوبەکرو ئەو خۆشەویستییەی کە لە ناخیدا بۆ پێغەمبەری خوای هەڵگرتبوو. خوای گەورە شایەتی بۆ ئەم خۆشەویستییە دەدات، بۆیە باسی لە قورئانی پیرۆزدا تۆمار کرا...

## گیانفیدایی مێرد منداڵێك

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هێنا بۆ مەدینەو لەوێ نیشتەجێبوو، مێرد منداڵێکی جوان چووە خزمەتی بەناوی (طلحة)ی کوڕی (براء)و باوەشی دەکرد بە جەستەی پیرۆزیداو دەستەکانی ماچ دەکردو بە دەورووپشتیدا دەهات و دەچوو، دەیوت: پێغەمبەری خوا فەرمانێکم پێبدە با جێبەجێی بکەم، سوێند بێت فەرمانەکەت نەشکێنم!، پێغەمبەریش (ﷺ) زەردەخەنەیەکی بۆ کردو خۆشحاڵ بوو بە غیرەتی ئەو مێرد منداڵە جوانە... بۆیە بە گاڵتەوە پێی وت: بڕۆ باوکت بکوژە!.

(طلحة) دەست بەجێ بەڕاکردن رووەو لای باوکی رۆیشت بە حیساب بیکوژێت، پێغەمبەری خوا بانگی کردەوەو پێی فەرموو: کوڕم گاڵتەم لەگەڵدا کردی خوای گەورە منی نەناردووە بۆ پچڕانی پەیوەندی رەحم و خزمایەتی، بەڵکو هاتووم رەحمەت بم بۆ خەڵك و پەیوەندی خزمایەتیش بەهێز بکەم.

ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی (طلحة)ی مێرد منداڵ نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا هاتە لایەو سەردانی کرد، لە رۆژێکی سەرماو سۆڵەی زستاندا نەخۆش کەوتبوو، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کەمێك لای دانیشت و پاشان هەستاو لە دەرەوە بە هەندێ لە هاوەڵانی فەرموو: ئەم منداڵە نەخۆشییەکەی سەختەو لەوانەیە بەم نزیکانە بمرێت، ئەگەر شتێکی وەها روویدا، دەست بەجێ بنێرن بە دوامدا، بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەم. چەندجارێك ئەمەی لێ دووپات کردنەوە، بۆ ئەوەی لەبیریان نەچێت!.

لە گەڕانەوەدا هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە گەیشتبووە سنووری خێڵی (بەنی سالم) شەو تاریکی کردو، (طلحة) باری نەخۆشییەکەی بەرەو خراپتر دەچوو، لە سەرە مەرگدا بە دانیشتوانی وت: تکاتان لێدەکەم ئەگەر مردم، ئازاری پێغەمبەری خوا مەدەن و مە نێرن بە شوێنیدا، چونکە دنیا شەوەو

تاریك و ساردیشه، دەترسم لە ڕێگەدا خێڵی جوولەكە پیلانێكی بۆ دابنێن و شەهیدی بكەن، لەبەرئەوە ئەگەر مردم دەست بەجێ‌ئەسپەردەی خاكم بكەن و بە خوای خۆمم بگەیەنن.

پاش كەمێك لە وتنی ئەم قسانە (طلحة) گیانی سپاردوو، خزمەكانیشی بەو شێوەیان كرد كە خۆی وەسیەتی كردبوو، بۆ سبەینێ بەرەبەیان كە ڕۆژ بۆوەوە هەواڵیان دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بێتاقەت بوو، تەشریفی بەپەلە هات و چووە سەر گۆڕەكەی‌و خەڵكی لە دوای خۆیەوە ریزكردو هەردوو دەستی مووبارەكی بەرزكردەوەو فەرمووی: (ألق طلحة وأنت تضحك إليه وهو يضحك إليك) واتە: (خوایە گیان بە شێوەیەك پێشوازی لە (طلحة) بكەیت كەتۆ بۆ ئەو پێكەنیت و ئەویش بۆ تۆ پێبكەنێت)..

ئای كە میهرو خۆشەویستییەكی گەورەیە، پێغەمبەری مەزن (ﷺ) بەرامبەر بەو گەنجە جوانە دەی نوێنێت، ئەوەیە لوتف و بەزەیی، ئەوەیە بەرزی و بڵندی سەركردە... لەگەڵ ئێش و ئازارەكانی میللەتدا دەژی و لە گەڵیاندا پێدەكەنێ‌و لەگەڵیشیاندا بە كوڵ دەگری...

## بازرگانییەکی بە بەرەکەت

لەم دیمەنەدا دەچینە خزمەت هاوەڵێکی تری پێغەمبەر کە بە زمان عەرەب نییەو یەکێکە لە گەورە پیاوانی (صحابة)و لە لایەن پێغەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەر بێت) مەدالیای رێزو شکۆی لە مل کراوەو وەصف و سەنای کردوە. لەم دیمەنەدا هەروەکو خۆی دەگێڕێتەوە، بابچینە خزمەتی و بزانین ئەو دیمەنەی تیایدا عەقیدەو فیکر سەرکەوت بەسەر چاوچنۆکی ماڵی دونیادا لەسەر دەستی چ هاوەڵێکی مەزندا بوو!.

ئەو هاوەڵە مەزنە (صوهەیبی رۆمی)یە، صوهەیب دەیگێڕێتەوە: ئەو رۆژەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکردا کۆچی کرد بۆ مەدینە. هیممەتم دایە خۆم و ویستم لەگەڵیاندا بڕۆم، بەڵام لە رێگەدا کۆمەڵێك گەنجی قورەیشی رێگەیان پێگرتم و نەیان هێڵا دەرچم، بۆیە پەرێشان بووم و شەوانە جێگە نەیدەگرتمە خۆ، هەر دەهاتم و دەچووم، هەرچۆنێك بێت چاوەڕێم کرد تا نیوەشەو داهات و موشریکان نووستن، دەست بەجێ بەڕێکەوتم، دیسانەوە شوێنم کەوتنەوەو ئەمجارەشیان لە قەراغی شاردا گرتمیانەوەو نەیان هێشت دەرچم، وتیان: تۆ خەڵکی ئەم شارە نیت، بە دەست بەتاڵی هاتوویتە ئێرە، ئەم پارەو سامانەی پەیدات کردووە دەبێت دای بنێیت ئینجا رێگەت پێدەدەین کە بڕۆیت!، ئەویش باوەڕی نەدەکرد کە بەوە رازی بن، بۆیە تەئکیدی لێکردنەوە، کە ئەگەر بێت و ئاڵتوون و سامانەکەی خۆیان بداتێ ئایا رێگەی دەدەن بڕوات؟!

وتیان: بەڵێ، رێگەت دەدەین، ئەویش هەموو سەروەت و سامانەکەی خۆی پێدان و بە دڵێکی بەختیارو ئاسوودەوە بەرەو شارەکەی (یثرب) کەوتە رێ، صوهەیب دەڵێ: کە دەرچووم نەوەستامەوە هەتا گەیشتمەوە بە پێغەمبەری خوا لە مزگەوتی (قباء)لایدابوو، پێش ئەوەی تەشریفی هەستێت فریای کەوتم،

که له دووره‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) به‌دی کردم به‌و له‌فزو وته شیرینه‌ی خۆی رووی تێکردم و فه‌رمووی: (ئه‌بو یه‌حیا.. به راستی سه‌وداو مامه‌ڵه‌که‌ت قازانجی کرد)، صوهه‌یب ده‌ڵێت: وتم ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ئه‌م که‌ین و به‌ینه ته‌نها له نێوان من هه‌ندێك پیاوانی قوره‌یشدا بووه، هیچ که‌سێکیش پێش من نه‌گه‌یشتۆته لای جه‌نابت هه‌تا ئه‌م هه‌واڵه‌ت پێ رابگه‌یه‌نێت، سوێند بێت ئه‌م هه‌واڵه‌ت له لایه‌ن جوبریله‌وه پێگه‌یشتووه.

ریوایه‌ته‌کان ده‌ڵێن: له‌م باره‌وه خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌ته‌ی نارده خواره‌وه (ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله والله رؤف بالعباد)، جا لێره‌دا تێبینی خاڵێکی گرنگ ده‌که‌ین که ئه‌و گیانی له‌خۆبوردنی گه‌وره‌یه‌ی صوهه‌یبه له‌به‌رده‌م تاقیکردنه‌وه‌ی سه‌روه‌ت و سامانی دنیادا که به زه‌حمه‌ت و هه‌وڵی شه‌وو رۆژو ته‌مه‌نێکی سه‌خت کۆی کردبۆوه، به‌ڵام لێره‌دا له‌به‌ر خه‌می عه‌قیده‌و فیکردا هه‌موو خه‌مه‌کانی تر ده‌ره‌وێته‌وه‌و به بادا ده‌چێت، بۆیه کاتێك مرۆڤی ئیماندار وه‌کو عه‌قیده‌و قه‌ناعه‌تێکی فیکری ته‌واو باوه‌ڕ به ئیسلام ده‌هێنێت ئه‌وجا ئاماده ده‌بێت که موڵك و ماڵ بگره دڵۆپه خوێنه‌کانی جه‌سته‌شی به خوا ببه‌خشێ، ئه‌مه‌ش ئه‌و بازرگانییه مه‌زنه‌یه که پێغه‌مبه‌ری خوا لێره‌دا جه‌ختی له‌سه‌ر ده‌کاته‌وه‌و ده‌ست خۆشی ته‌واو له صوهه‌یب ده‌کات، له‌هه‌مان کاتیشدا قورئانی پیرۆز ئه‌م (صفقة) بازرگانییه‌گه‌وره‌یه به‌سه‌رده‌کاته‌وه‌و ده‌فه‌رموێت:( هل أدلكم على تجارة تنجيكم من عذاب، أليم...) واته: ئایا هه‌واڵی بازرگانییه‌کتان بده‌مێ که له سزای سه‌ختی دۆزه‌خ رزگارتان بکات....،بازرگانییه‌که‌ش ئه‌و به‌یعه‌ت و به‌ڵێنه مه‌زنه‌یه که مرۆڤی مسوڵمان رۆژانه بۆ خوای دووباره ده‌کاته‌وه‌که گیان و ماڵی له پێناو بانگه‌وازه‌که‌یدا خه‌رج بکات و به‌وه‌ش ره‌زامه‌ندی خوای ده‌ست بکه‌وێت و بگاته کاروانی سه‌روه‌رێتی و قافڵه‌ی پیاوه مه‌زنه‌کانی مێژوو له پێغه‌مبه‌ران و راستگۆیان و صاڵحان و پیاو چاکان و شه‌هیدان (وحسنت أولئك رفيقا)، ئای که چه‌ند گه‌وره‌یه هاوه‌ڵێتی ئه‌و مرۆڤانه.

## خێزانێکی کەم وێنە

پاش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)گەیشتە مەدینە لەسەر مەسەلەی نیشتەجێ بوونی لە یەکێ لەماڵەکانی ئەنصاردا خەریکبوو دەمە قاڵێ دروست بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە وشترەکەی دابەزی‌و فەرمووی: (وازی لێ بهێنن... لە کوێدا وەستا ئەو شوێنە دەکەینە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)... کاتێك وازیان لە وشترەکە هێنا، لە جێگەیەکدا وەستا پارچە زەوییەکی سەحرا بوو، موڵکی دوو منداڵی بێ باوکی مەدینە بوو لە خێڵی بەنی (نەجار)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی کڕین و مزگەوتەکەی تێدا دروست کرد، خۆشی هەتا تەواو بوونی مزگەوتەکە لە ماڵی (ئەبو ئەیوبی ئەنصاری) دابەزی، دوای تەواو بوونی مزگەوتەکە گوێزایەوە بۆ مزگەوت.

جا بەڕێزان با ئێستا بزانین ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەری خوا خۆیان و ماڵ‌و منداڵیان چۆن خزمەتیان دەکردو بە چ شێوەیەك خۆشەویستی خۆیان بۆ مەزنترین میوانی دنیا دەردەبڕی، ئەبو ئەیوب خۆی دیمەنەکانی ئەو ڕۆژەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا لە ماڵەکەی من دابەزی، لە بەشی خوارەوەی ماڵەکەمدا ژوورێکم بۆ ئامادەکرد، خۆم و خێزانیشم لە سەرەوە دادەنیشتین، پاشان بیرم کردەوە چۆن دەبێت من لە سەرەوەی پێغەمبەرەوە بم؟! بۆیە ئارامم لێ بڕاو چوومە خزمەتی و وتم: پێغەمبەری خوا دایك و باوکم بە قوربانت بێت، ئارامم نییە بە لامەوە سەختە کە من و خێزانم لە قاتی سەرەوە بین و تۆ لە ژێر ئێمەدا لە ژوورەکەی خوارەوە بنوویت، بۆیە داوا لە بەڕێزت دەکەم تەشریفت بڕۆیتە سەرەوەو ئێمەش دێینە خوارەوە.

جا بەڕێزینە... چی زیاتر پەرێشانی کردم و وای لێکردم کە داوای لێبکەم تەشریفی بڕواتە سەرەوە: کاتێك لە سەرەوە بووین شەربەیەکی پڕ لە ئاومان دانا شکا، ئاوەکە بەزەوی ژوورەکەدا پرژاو زۆر لەوە دەترسام تنۆکی ئاوەکەی

بتكێته خوارەوەو ئازاری پێغەمبەری خوا بدات، بۆیە بە خێرایی خۆم و دایكی ئەیوب بەو تەنها بەتانییەی كە خۆمان پێ دادەپۆشی كەوتینە سڕینەوەی زەوییەكەو وشك كردنەوەی، هەموو جارێكیش كە نانمان ئامادە دەكرد پێش ئەوەی كە خۆمان لێی بخۆین دەمان نارد بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، كاتێك نانەكەمان دەهێنایەوە من و دایكی ئەیوب دەگەڕاین بزانین پێغەمبەری خوا لە كاتی خواردنەكەدا دەستی پیرۆزی لە كوێ داناوە ئێمەش لەو شوێنانەمان دەخوارد، بۆ ئەوەی خێرو بەرەكەتمان دەست بكەوێت.

بەڕێزان لەم دیمەنە پڕ لە ڕێزو خۆشەویستییەدا دەبینین كەچۆن ئەبو ئەیوب بە چاوی ڕێزو خۆشەویستییەوە سەیری پێغەمبەری خوا دەكات و ماڵو منداڵی لە خزمەت حەوانەوەو ئارامی ئەو زاتە مەزنەدا كار دەكەن و خزمەت دەكەن، ئەمڕۆ لە دنیای ئێمەدا پێغەمبەری خوا بە جەستەو گیان لەناوماندا نییە، بەڵام وەكو گوفتارو ڕەفتاری شیرین لەناو زیندوواندا زیندووەو چاوگەی دووەمی مەعریفەو زانیارییە گرنگ و بەهادارەكانی شەریعەتە: بۆیە خۆش ویستن و ڕێز لێگرتن و بە دەمەوە چوونی ڕاستەقینە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بریتییە لە: زیندوو كردنەوەی سوننەتە مەزنەكانی و بە دڵ ڕازیبوون و شوێن كەوتنیان.

## ماڵو سامانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

(حارثە)ی کوڕی نەعمانی ئەنصاری ماڵێکی هەبوو نزیك بە ماڵی پێغەمبەری خوا لە ناو شاری مەدینەدا...

(حارثە) ئەم دراوسێیەتییەی زۆر پێ خۆشبوو، خۆی دەگێڕێتەوە: لە نێوان ئێمەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنورێکی نانکردنمان هەبوو، رۆژێك ئەو نانی پێدەکردو رۆژێکیش ئێمە، هەموو شەوانێکیش بە ئەسپایی لە یەکێ لە ژوورەکانی ماڵەکەمەوە گوێم دەگرت بۆ نزاو پاڕانەوە بە کوڵەکانی و ئەو دەنگە زووڵاڵەی کە قورئانی پێ دەخوێند... دەنگی پیرۆزی ئەوەندە خۆشبوو مرۆڤی بەلای خۆیدا ئالودەو کەمەند کێش دەکرد، چەن مەزنە وشەیەك کەلامی خوای مەزن بێت و مرۆڤێکی مەزنی وەك (محمد)ی پێغەمبەر بیخوێنێ‌و داخۆ دەبێ کەش و هەوای ئەو دیمەنە روحییە دڵڕفێنە چۆن بێت و بە چ شێوەیەك وەصف بکرێت... من ناتوانم ئەو وەصفە بکەم تەنها ئەوەندە دەڵێم: کەمەند کێشی ئەو دەنگ و صەدا نازدارە بوو بووم و بێ ئەو دڵم ئارام نەدەبوو!.

(حارثە) لەو نزیکانەدا کۆمەڵێك خانووی تری هەبوو، رۆژێکیان پێغەمبەری خوا (زەیدی کوڕی حارثە)و ( ئەبا رافیع)ی بانگ کردو دوو وشتری پێدان و فەرمووی: بڕۆن بۆ مەککە کچەکانم بۆ بهێنن، ئەوانیش رۆیشتن وگەڕانەوە هەردوو کچەکەی پێغەمبەری خوا (فاطمە)و (أم کلثوم)و (سەودە)ی خێزانی (أم أيمن) خێزانی زەیدو کوڕەکەیان هێنابوو، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرو هەموو منداڵەکانی تریان پێبوو، بۆیە ماڵەکەی پێغەمبەر هەموو ئەوانەی تێدا جێگە نە دەبۆوە، (حارثە) چەند ماڵێکی تری خۆی بۆ چۆڵ کردن و چوونە ناوی، حارثە پیاوێکی نان بدەو سەخاوەت مەند بوو، هەموو شتێکی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دانابوو... پاش ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب)یش (فاطمە)ی کچی پێغەمبەری خواست، پێغەمبەری خوا ویستی لە ماڵەکەی

خۆیدا جێیان بکاتەوە، (فاطمە) (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: بابە گیان تکات لێدەکەم قسەیەك لەگەڵ (حارثە)دا بکەیت، ماڵێکی خۆیمان بداتێو تێیدا دابنیشین. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: فاطمە سوێند بێت بە خوا... ئەو پیاوە ئەوەندە چاکەی لەگەڵ کردووم ڕووم نایەت داوای لێ بکەم خانوویەکی خۆیم بۆ چۆڵ بکات، ئەم قسە کەوتبووە گوێی (حارثەی کوڕی نوعمان)، خێرا هاتە خزمەتی و وتی: پێغەمبەری خوا بیستوومە دەتەوێ فاطمەو هاوسەرەکەی ببەیتە ماڵەکەی خۆتەوە، بۆیە هاتوومەتە خزمەتت بۆ ئەوەی پێت بڵێم: خانووەکی تری خۆم چۆڵ دەکەم لەو خانووانەی کە نزیکترن لە خێڵی (بەنی نەجار)ن لە ماڵەکەی جەنابتانەوە. من خۆم و ماڵەکەشم بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی، بە خوا سوێندت بۆ دەخۆم ئەو ماڵەم زیاتر خۆش دەوێت کە تۆ وەری دەگریت تا ئەو ماڵەی کە ڕەتی دەکەیتەوە، کە حارثە ئەم سوێندە مەزنەی خوارد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ڕاست دەکەیت خوا بەرەکەت بخاتە خۆت و ماڵەکەتەوە.

ئەوەبوو(عەلی کوڕی ئەبو تالیب) (ڕەزای خوای لێ بێت) ماڵەکەی گوێزایە وە بۆ یەکێك لەو ماڵانەی (حارثە).

ماڵە ئەنصارییەکانی مەدینە، بۆ دەربڕینی خۆشەویستی زیاتر بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو شتێکدا ململانێو کێ بەرکێی یەکتریان دەکرد، (عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك) دەڵێ: (ئەوس)و (خەزرەج) وەکو دوو سواری مەیدانی ڕاکردن، موونافەسەی یەکتریان دەکرد، ئەگەر یەکێکیان گۆرانی بەسەر پێغەمبەریشدا بوتایە، ئەوی تریان دەیوت: نابێ ئێمەش لەو خێرە بێبەش بین. ئەمەیە پلەکانی عەشق و محەببەت، ئەمەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە لە نێوان پێغەمبەری سەرکردەو گەلە دڵسۆزەکەیدا، بەڕاستی وانەی خۆشەویستی هەروا دەبێت... هەزار سەڵاوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری نازدا (ﷺ)...

## گیانی لە خۆبووردەیی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش ئەوەی لە شارۆچکە جوانەکەی مەدینەدا نیشتەجێ ببێت، ماوەیەك لە (قباء) مایەوە، کۆچەرانیشی لەگەڵدا بوو، بۆیە کاتێك بنەو بارگەی پێچایەوە بۆ مەدینە، هاوەڵانی کۆچەریش لەگەڵیدا گوێزایانەوە، ئەنصارییەکان کە دانیشتووی شاری مەدینە بوون، رێزێکی بێوێنەیان لێگرتن، لەو مەیدانەدا لەسەر رێزگرتن لە میوانەکان پێش برکێی یەکتریان دەکرد، تا گەیشتە رادەیەك تیرو پشکیان لەسەر دەکردن، کۆچەرانیان بردە سەر کارو سەر مەزراکانی خۆیان و ماڵەکانی خۆیان بە تەواوی لەگەڵیاندا دابەش کردن، ئەوەی لە تواناندا بوو لە رێزو پێزانین لەگەڵ خوشك و برا کۆچەرەکانی خۆیاندا کردیان. ئەمەش بەشێك بوو لەو وەفادارییە مەزنەی ئەنصار لەبەردەم ئەو پەیمانە مەزنەدا کە پەیمانی (عەقەبە)یە بە پێغەمبەریان دابوو (ﷺ).

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: کۆچەرییەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتیان: پێغەمبەری خۆشەویست، بەڕاستی هەرگیز خەڵکی بەڕێزو سەخاوەت مەندی وەك ئەم شارەمان نەدیوە، لە کەمیدا دڵ نەوایمان دەکەن و لە بوونیشدا بەخشندەو نان بدەن، بەڕاستی لە هەموو شتێکدا بەشداریان کردووین، ئەوەندە چاکەیان لەگەڵدا کردووین، دەترسین ئەوان هەموو پاداشتە خواییەکە بۆ خۆیان بەرن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بریا زیاتریش بەوەتان بزانیایەو نزای خێریشتان بۆ بکردنایە، پاشان بە ئەنصارییەکانی فەرموو: برایانی بەڕێزم: برا کۆچەرییەکانتان کە کۆچیان کردووە، ماڵو منداڵو هەموو شتێکیان بەجێهێشتووەو هاتوون بۆ لاتان...

ئەنصارییەکان وتیان: ماڵەکانمان بەش دەکەین لە نێوانماندا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جگە لەوە دەتوانن چی دیکە ئەنجام بدەن؟

وتیان: وەکو چی ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: کۆچەرییەکان کۆمەڵێکن نازانن کار بکەن لە مەزراکاندا، داواتان لێدەکەم بەشێکی بەرووبوومەکانی خۆتانیان بدەنێ.

وتیان: بەسەر چاوان...

لە شەڕی خێڵی (بەنو نەضیر)دا پێغەمبەری خوا هەندێك دەست کەوتی شەڕی هاتە بەردەست، بۆ ئەوەی کەمێك قورسایی سەرشانی ئەنصارییەکان سووك بکات، بانگی کردن و هەموویان هاتن و دانیشتنێکی لەگەڵدا کردن، پاش حەمدو سوپاسی خوای گەورە، وەصفێکی مەزنی ئەو گیانی لەخۆ بوردنەی ئەنصارییەکانی کردو سوپاسی گەرمی کردن لەسەر ئەو رێزو تەقدیرەی کە لە براو خوشکە کۆچەرییەکانیان ناوەو قوربانی گەورەیان بۆ داون. پاشان پێی فەرموون: خۆتان دەزانن ئەم دەست کەوتی شەڕە بڕێکە لە ماڵ و سامان، ئەگەر پێتان خۆشە ئەم ماڵە لە نێوان ئێوەو کۆچەریاندا دابەش دەکەم، با کۆچەرییەکان لە شوێن مەسکەنەکانتاندا بمێننەوە، یان هەموو دەست کەوتەکان دەدەنە ئەوان و با لە ماڵو مەزارەکانی ئێوە بڕۆنە دەرەوەو ئێوەش خەریکی کاری خۆتان بن و ئەمەش بارسووکییەکە بۆ ئێوە. جا نازانم رای ئێوە بەرامبەر ئەم شێوازە چییە؟.

بۆ وەڵامی پێشنیارەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرۆکی هەردوو خێڵی (ئەوس)و (خەزرەج) کە دوو خێڵی سەرەکی مەدینە بوون، بریتی بوون لە (سەعدی کوڕی مەعاذ)و (سەعدی کوڕی عوبادە) (رەزای خوایان لێ بێت)، هەردووکیان بە یەك دەنگ وتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە داوا دەکەین هەموو دەست کەوتەکە بەسەر کۆچ کەراندا دابەش بکەیت و ناهێڵین لە ماڵو مەزراکانمان بڕۆنە دەرەوە، باوەکو خۆیان بمێننەوە، تۆ گەورەی ئێمەیت و ئەوانیش خوشك و برامانن...

هەموو ئەنصارییەکانی تریش بە یەك دەنگ هاواریانکرد: ئێمەش قبوڵمانە.

پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەبەردەم ئەم قوربانیدانەدا زۆر دڵخۆش بوو، نزایەکی خوێندەوە کە بە وەچەو نەوە دوای نەوەیاندا بڕواتە خوارەوەو فەرمووی:(اللهم ارحم الأنصار وأبناء الأنصار وأبنا أبناء الأنصار)، واتە: (خوایە گیان رەحم بە ئەنصارو رۆڵەکانیان و رۆڵەی رۆڵەکانیشیان بکەیت)، دوای ئەوە سامانەکەی لە نێوان کۆچەراندا بەش کردو دوو هەژاری ئەنصارییەکانیش بێبەش نەکرد لەو دابەشکردنەدا، چونکە کەم دەست بوون.

ئەم هەڵوێستەی هاوەڵان لە چڵەپۆپەی بەخشندەیی و قوربانیدان دایە، یەکێك ماڵی هەبێت دەزانێت ئەو هەڵوێستە چەندە گەورەیە، کە مرۆڤ دەست بەرداری بەشێکی زۆر لە بەرووبوومی یەك ساڵی تەمەن و ماڵو سامان و دەستکەوتەکانیش بێت بۆ خوشك و براکانی خۆی، لە بەرامبەر رەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەیدا، بەراستی شایانی ئەو نزاو پارانەوە مەزنەی پێغەمبەری خوان (ﷺ).

کاتێکیش سەرنجی هەڵوێستە پڕ لە سەروەرییەکانی ئیسلام دەدەین، ئینجا بۆت دەردەکەوێت کە ئەم سەرکەوتنانە چۆن و لەسەر دەستی چ جۆرە کەسانێك هاتوونەتە دی.

## ئاواتێکی سەرەمەرگ

(عەبدوڵلای کوڕی جەحش) (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پورزای پێغەمبەری خوایە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای بانگی عیشا بانگی کردم و فەرمووی: سبەینێ بەرەبەیان دوای نوێژی بەیانی چەك و تفاقی خۆت بهێنەو سەرێکم لێبدە، دەمەوێت بەلایەکدا بت نێرم.

(عبدالله) دەڵێ: لەگەڵ بەرەبەیاندا چوومە خزمەت پێغەمبەری خواو چەك و تفاقی تەواوم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتبوو، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) نوێژی بۆ خەڵکەکە کردو هاتە دەرەوە، لەبەر دەرگا بە خزمەتی گەیشتم، کۆمەڵێك لە کۆچەرانی لەگەڵدا بوو، (أبی کوڕی کەعب)ی بانگ کردو نامەیەکی پێ نووسی و دایە دەستم و فەرمووی: ئەوا تۆم کردووە بە ئەمیری ئەم کۆمەڵە کەسەی دەیانبینی، بکەوەرە رێ هەتا دوو شەوی تەواو نامەکە مەکەرەوە، پاش ئەو ماوەیە نامەکە بکەرەوە چی تێدایە جێبەجێی بکە.

وتم: پێغەمبەری خوا بەرەو چ لایەك بکەومە ڕێ؟

فەرمووی: ڕێگەی (نجدیە) بگرەبەر.

بەڵێ... (عبدوڵلای کوڕی جەش) لەگەڵ هەشت کەسیی تری کۆچەراندا بەڕێکەوتن، پاش ئەوەی دوو شەوی پێ چوو نامەکەی کردەوە، تێیدا نووسرابوو:(ئەگەر سەیری ئەم نامەیەت کرد بکەوە ڕێ هەتا دەگەیتە (بطن النخلة) کە دەکەوێتە نێوان مەککەو تائیفەوە، لەوێ بمێنەرەوە، چاودێریەکی وردی جمو جوڵی قورەیشم بۆ بکەو هەواڵیانم بۆ بهێنەرەوە، بەڵام زۆر لەو سەفەرەتدا بەکارمەهێنەو کەس لەگەڵ خۆتدا بەزۆر مەبە.

کاتێك (عبدلله) نامەکەی خوێندەوە وتی: بەسەرچاوان.

پاشان رووی کردە هاوەڵەکانی پێی وتن: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوم بگەمە (بطن النخلة)و هەواڵی قوڕەیشی بهێنمەوەو لە هەمان کاتیشدا

فەرمانی پێداوم لەم سەفەرەمدا زۆر لە هیچ کامتان نەکەم، کامتان حەزی لە شەهادەتە با لەگەڵمدا بەڕێبکەوێت، هەرکەسیش پێی ناخۆشە با بگەڕێتەوەو زۆرمان لەسەر نییە، هەموویان هاواریان کردو وتیان: بەسەرچاوان، ئێمەش قسەمان لەگەڵ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی و تۆ دایە،بەڕێبکەوە پشت بەخوا.

بەڕێکەوتن تا گەیشتنە شوێنی دیاریکراو، بەبێ ئەوەی هیچ کامێکیان دوابکەون.

کە ڕۆژی جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە، عبدالله هاتە پێشەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و وتی: پێغەمبەری خوا ئەوا خۆت دەبینی سوپای دوژمن بەرامبەرمان وەستاون، منیش لەگەڵ دڵی خۆمدا داوام لە خوای خۆم کردووە کە لەم جەنگەدا شەهید بکرێم و دوژمن لاشەکەم بشێوێنن، بەوشێوەیە بە خوای خۆم بگەم و پرسیارم لێ بکات بۆچی وات لێکراوە؟، منیش بڵێم: خوایە لەبەر تۆ، ئینجا ئەی پێغەمبەری خوا (ئەگەر مۆڵەتم بدەیت) داوایەکم لە بەڕێزت هەیە. پێغەمبەری خوا فەرمووی: بفەرموو داواکەت چییە؟

عبدالله وتی: داوات لێدەکەم کە پاش خۆم میرات و سەروەت و سامانەکەم هەمووی بۆخۆت بێت خۆت بەڕێوەی بەریت.

ئەویش فەرمووی: باشە.

دوای ئەوەی جەنگ دەستی پێکرد، شەڕ گەرم بوو، کارەساتی شەهید بوونی ئەو کۆمەڵە هاوەڵەی پێغەمبەری خوا - لەسەروو هەموویانەوە حەمزەی مامی پێغەمبەر - ئازارێکی گەورەی لە دڵی پێغەمبەری خوادا بەجێهێشت، لەناو شەهید بووەکاندا (عبدالله ی کوڕی جەش)ی تێدا بوو، هەموو جەستەو گیانی بە نووکە شمشێرو رم ئاژن ئاژن کرابوو، چونکە موشریکەکان دوای شەهید بوونی جەستەی پیرۆزیان شێواندبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ حەمزەی مامیدا هەردووکیانی خستە ناو یەك گۆڕەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت).

## مرۆڤە خاوەن هەڵوێستەکە

پاش ئەوەی کە مسوڵمانان لە ناو شاری مەدینەدا نیشتەجێ بوون، موشریکەکان بۆ فشار خستنە سەریان کەوتنە تاڵانکردنی هەرچی ماڵو سامانیان هەیەو دەستیان کرد بە ئازاردانی ئەو کەس و کارانەیان کە نەیانتوانی بوو کۆچ بکەن. بۆیە خوای گەورەو باڵا دەست مۆڵەتی فەرموو بە مسوڵمانان کە چیتر لە زوڵم و زۆری موشریکەکان بێدەنگ نەبن و دەستیان لێ بکەنەوە.

یەکەمجاری دەست کردنەوە لەوێوە دەستی پێکرد کە کاروانێکی بازرگانی سەرانی قورەیش لە رێی شامەوە بەرەو مەککە دەگەڕایەوە، ئەوەبوو ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب سەرکردایەتی دەکردو زۆربەی سەروەت و سامانەکەش هی ئەو بوو، بۆیە دەرفەتێکی باشبوو بۆ پێغەمبەری خواو مسوڵمانەکان ئەو مافەی خۆیان وەربگرنەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی (٣٠٠) کەسی لەگەڵ خۆیدا بردوو لە نزیك کانیاوەکانی (بەدر) بارگەیان لێخست.

هەواڵ گەیشتە ئەبوسوفیان ئەویش کابرایەکی شارەزای بیابان بوو، بۆیە رێڕەوی کاروانەکەی گۆڕیو مسوڵمانان تووشیان نەهاتن، بەڵام کەموشریکەکانی مەککە بەمەیان زانی، کەوتنە خۆ کۆکردنەوەو (٩٠٠) چەکداری سەر سەخت و کوڕی شەڕکەریان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو بۆ شەڕکردن، لەگەڵ پێغەمبەری خواو مسوڵمانەکاندا... پێش ئەوەی هەردوو سوپاکە بەرامبەر بووەستن و جەنگەکە گەرم بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی هیمەت و ئیرادەو توانای هاوەڵەکانی تاقی بکاتەوەو بزانێ چەند ئامادەن بۆ رووبەڕوو بوونەوە، ئیبن ئیسحاق دەڵێت:کاتێك کە پێغەمبەری خوا بیستی خێڵی قورەش سوپایەکی گەورەیان بۆ کۆکردونەتەوەو کاروانەکەشیان

دەرباز بووە، تێگەیشت کە شەڕ روودەدات و هاوەڵانیش دەرکیان بەوە کردبوو، کۆی کردنەوەو پێی فەرموون: کێ قسەی هەیە لە ئێوە با بفەرموێت؟

ئەبوبەکر (ﷺ) هەستاو کۆمەڵێك قسەی باشی کرد، دوای ئەو میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندی هەستاو وتی: پێغەمبەری خوا بەرەو ئەو شوێنە بکەوە رێ کە خوا بڕیاری لەسەرداوە، ئێمەش بەدڵو بەگیان لە گەڵتا دەبین، سوێند بێت بەخوا... ئێمە هەرگیز ئەوەت پێ ناڵێین کە (بەنی ئیسرائیل) بە (موسا)یان وت:(إذهب أنت و ربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون)، واتە:(بڕۆ خۆت و خواکەت شەڕ بکەن، ئێمە دادەنیشین و چاوەڕوانت دەکەین).. نەخێر ئەوە هەرگیز کردەی ئێمە نییە، بەڵکو دەڵێین: بکەوەرە رێو لەگەڵ خوای خۆت دژ بە بێباوەڕان بجەنگە، ئێمەش پشتیوانت لێدەکەین و لەگەڵیان دەجەنگین و سوێند بێت بەو کەسەی تۆی بە حەق بۆ ئێمە ناردووە... ئەگەر سەرمان بنێیت بە (برك الرماد)یشەوە لە خزمەتتدا دەبین و شەڕدەکەین هەتا دەگەیت بە ئامانجی خۆت.

پێغەمبەری خوا گوێی لەم قسانە بوو، پێی باش بووو دوعای خێری بۆ کرد، پاشان رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: بەڕێزینە کێی ترتان قسەی تری هەیە با بیکات، پێم خۆشە هەندێکی ترتان قسە بکەن، (لەم قسانەدا مەبەستی ئەنصارییەکان بوو، چونکە هەچی هەستاو قسەی کرد لە کۆچەرییەکان بوو، لە لایەکی تریشەوە بەشێکی زۆری سوپاکە لەوان پێکهاتبوو، پێغەمبەری خوا بەیعەتی عەقەبەی لەبەرچاو بوو دەیویست بزانێت چەندە هیممەتیان بەرزەو چەند لەسەر وەفاو بەڵێنەکەیان سوورن، چونکە لەکاتی خۆیدا وتبوویان: پێغەمبەری خوا... هەتا نەگەیتە لامان ناتوانین لەئەستۆت بگرین، هەرکە گەیشتیتە لامان لە ئەستۆو گەردنی ئێمەدایت و پارێزگاریت لێدەکەین، ئەمڕۆ هەروەکو چۆن بەرگری لە خێزان و ماڵو منداڵی خۆمان دەکەین ئاواش بەرگری لە تۆ دەکەین، پێغەمبەری خوا حسابی بۆ ئەوە کردبوو کە نەبادا ئەوان واحاڵی بووبن کە دەبێت دوژمن بدات بەسەر مەدینەدا ئەوجا ئەوان دەست بکەنەوە،

دەیویست بزانێ مەدینەییەکان لە دەرەوەی شارەکەشیاندا ئەو هەڵویستە دەنوێنن!) بۆیە کاتێك ئەمەی رونکردەوە (سەعدی کوڕی مەعاذ)- کە سەرۆك خێڵی (ئەوس) بوو- هەستایە سەرپێو وتی: وا دەزانم لەگەڵ ئێمەت بێت ئەی پێغەمبەری خوا؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ مەبەستم ئێوەیە.

ئینجا سەعد وتی: پێغەمبەری خوا ئێمە باوەڕمان پێ هێناویت، متمانەمان پێکردوویت، شایەتیمان دا لەسەر ئەوەی کە هەرچی تۆ هێناوتە هەق و راستە، لەسەر ئەوانە ئێمە وادەو بەڵێنی پیاوانەمان پێداویت، لەسەر بەگوێکردن و فەرمان نەشکاندن، بەڕێ کەوە ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەو کارەی خۆت مەبەستتە، ئێمە لەگەڵتداین سوێند بێت بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ناردووە، ئەگەر بەسەر شەپۆلی ئەو دەریایەدا بمان بەیت لەگەڵتاین، تەنها یەك پیاومان دواناکەوێت، هەرگیز ترسیشمان لەوە نییە بمان بەیت بەگژ دوژمنەکەماندا، ئێمە مرۆڤی جەنگاوەرین لە شەڕدا دان بەخۆدا دەگرین، لە پێکداداان و هەرای جەنگیشدا راستگۆیانە دەجەنگین - بەڵکو خوای گەورە سەبارەت بە ئێمە دڵ ئارامت بکات - بکەوەرە رێ لەسەر بەرەکەتی خوای پەروەردگار.

ئەم قسانەی سەعدی کوڕی مەعاذ پێغەمبەری خوا ی دڵخۆش کردو ئینجا فەرمووی: پشت بەخوا بەڕێکەون... مژدەتان لێ بێت، خوا مژدەی یەکێك لەو دانانەی داومەتێ (مەبەستی کاروانەکەو ئەو کۆمەڵە چەکدارە زۆرە بوو کە هاتبوون بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا)، لە پێش چاومە چۆن لە خوێناوی خۆیان دەگەوزێن.. ئینجا سەعید وتی: پێغەمبەری خوا حەزدەکەم لەپشتی سوپاکەی خۆماندا کەپرێکت بۆ دروست بکەم بۆئەوەی تێیدا دابنیشیت و لەوێوە سەرکردایەتی شەڕەکە بکەیت و بە دوور بیت لەوان، تاوەکو ئەگەر لە شەڕەکەدا خوا سەری خستین ئەوا بە ئاواتی خۆمان گەیشتووین و دڵمان خۆش دەبێت، خۆ ئەگەر خوا نەخواستە وانەبوو، چەك و تفاقەکەمان

بپێچەرەوەو بگەڕێرەوە بۆ شاری مەدینە... چونکە لەوێ کۆمەڵێکمان بەجێ هێشتووە لە ئێمە زیاتر تۆیان خۆش دەوێت و بیانزانیایە دەکەوێتە شەڕەوە هەرگیز دوانەدەکەوتن، بگەڕێرەوە لای ئەوان لە ئێمە زیاتر بەرگریت لێدەکەن.

پێغەمبەری خوا سوپاسی گەرمی کردن و دوعای خێری بۆ کردن، پاشان کەپرەکەیان لە پشتی سوپاکەوە بۆ پێغەمبەری خوا دروستکرد... لەم هەڵوێستە مەزنەی (سەعدی کوڕی مەعاذ)دا یەك حەقیقەتی روون بەرچاو دەکەوێت، ئەویش خەمی خەمەکانە، کە لەسەر هەمو خەمێکی ترەوە بۆتە خولیای سەعدو ترسی ئەوەی هەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی ئازارێك بێت. ئەم حەقەیقەتە راستەقینە هەڵقوڵاوی خۆشەویستییەکی قوڵی هاوەڵانە بەرامبەر پێغەمبەری مەزن (ﷺ)و ئەو پەیامە ڕێزدارەی هێناویەتی، هەرکەسێك کەمەند کێشی مەحبوبی خۆی بێت بەم شێوەیە دەبێت، خەمی بۆ دەخواو بۆی دەسوتێت، ئەوەتا پێش ئەوەی بیر لە ژیان و مردنی خۆی بکاتەوە نەخشە بۆ پێغەمبەر دادەنێت نەبادا تووشی زیان بێت. رەزاو رەحمەتی خوا لەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ).

دیداری ئەیەم

## دوا ئاوات

ئیبن ئیسحاق دەگێڕێتەوە: لە کاتێکدا کە هەردوو سوپای مسوڵمانان و موشریکان لە نزیك ئاوەکانی بەدر بەرامبەر یەك وەستان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرگەرمی ڕێك و پێك کردنی ڕیزی چەکدارەکان بوو، تیرێکی بەدەستەوە بوو بەو تیرە ڕیزەکانی ڕێك دەکرد، بەلای ڕیزێکدا تێپەڕی کردو سەیری کرد پیاوێکی قەڵەویان تێدا بوو ناوی (سەودای کوڕی غوزەیە) بوو، تۆزێ ورگی لە پێشەوە بوو،ڕیزەکەی ناشیرین کردبوو، پێغەمبەری خوا کلکێکی تیرەکەی دەستی بەسوکی بە ورگی کابرادا داو پێی فەرموو: (سەودا) کەمێك بڕۆ دواوە با ڕیزەکەتان ڕێك بێت!.

سەودا هاواری لێ هەستاو وتی: بەڕاستی ئازارت دام ئەی پێغەمبەری خوا!، مادامەکی خوا تۆی بەحەق ناردووە داوای تۆڵە دەکەم، دەبێ حەقەکەم بدەیتەوە!.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: حەقی خۆتە، کراسەکەی هەڵدایەوەو فەرمووی : تۆڵەی خۆت بکەرەوە!.

(سەودا) کە پێغەمبەری خوای بەوشێوەیە بینی دەستی کردە ملی پێغەمبەری خواو سکی پیرۆزی ماچکرد!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم کارەی سەودای بەلاوە سەیر بوو، فەرمووی: ئەوەچییە (سەودا) بۆ وادەکەیت؟!

سەودا وتی: پێغەمبەری خوای خۆت دەزانی ئەمڕۆ ڕۆژی پێك دادان و ڕووبەڕووبوونەوەیە، حەزم کرد لە دواچرکەساتەکانی ژیانمدا پێستم بەر پێستی ئەو لەشە پیرۆزەت بکەوێت و بە ئاگری دۆزەخ نەسووتێم.

پێغەمبەری خوای (ﷺ) دوعای خێری بۆ کرد.. هەندێك لە ریوایەتەکان دەڵێن: (سەودا) هەستی کردبو کە ئەوە دوا ساتەکانی ژیانیەتی، بۆیە حەزی دەکرد لە ساتەکانی ماڵئاواییدا دەستی لە ملی پێغەمبەری خوادا بێت و جەستەی بە جەستەو گیانی پیرۆزی بەرەکەتدار بێت، ئەوە بوو لە شەڕەکەدا (سەودا) شەهید کراو بە مەنزڵگای سەروەرێتی دڵو دەروونی شادبوو.

بەرێزان ئەگەر هەموو سوتاوەکانی کاروانی عەشق و مەحەببەت تەزبیحەو وشەی خۆیان بە باڵای خۆشەویستیدا بهۆننەوە، هەرگیز ناگەنە ئەم مەقام و پایە پیرۆزو بڵندەی کە هاوەڵان پێی گەیشتبوون، بۆیە بە حەق شایستەی ئەوەبوون شەرەفی هاوەڵێتیان دەست بکەوێت. رەحمەت و رەزای خوا لەسەر یاران و شوێن کەوتوان و هەموو ئەوانەی لەو کاروانە رێزدارە بەرێدەکەون و باوەڕی پێ دەهێنن...

دیداری پانزەیەم

# چەند هەڵوێستێك

لە کاتێکدا کە هەردوو سوپای مسوڵمانان و موشریکانی مەککە بەرامبەر یەك وەستاون، موشریکەکان داوایان کرد کە چەند کەسێك لە مسوڵمانەکان بێنە دەرەوەبۆ موبارەزە تاکە کەسی لەگەڵیاندا، پێغەمبەری خوای (ﷺ) ئەمری فەرموو کە (حەمزە)ی مامی وهەردوو ئامۆزاکەی (عەلی)و (عوبەیدە) بۆیان بڕۆنە دەرەوەو پێی فەرموون: هەستن پێشوازی لە بەهەشتێك بکەن کە پانتاییەکەی بەقەد هێندەی ئاسمانەکان و زەمین.

لە موبارەزەکەدا هەرسێکیان سێ موشریکەکەی بەرامبەریان کوشت، بەڵام (عوبەیدە) پاش کوشتنی بەرامبەرەکە بە خەستی بریندار بوو، (حەمزە)و (عەلی) لە گۆڕەپانی جەنگدا هەڵیانگرت و هێنایانە پێشەوەی سوپاکە، بۆ لای پێغەمبەری خوای (ﷺ)، (عوبەیدە) هەتا گەیشتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەسەر باڵای شەهیدی و سەربەرزی مسوڵماناندا شیعری دەخوێندەوە.

کاتێك لە پێغەمبەری خوا نزیك بوونەوە لە نوێژدا بوو، کە لە نوێژەکەی بۆوە، (عوبەیدە) وتی: پێغەمبەری خوا ئەگەر ئێستا (أبو طالب) بمایە باش دەیزانی کە ئێمە لەو زیاتر بەرگری لە تۆ دەکەین و زۆر چاك خۆمان بە قوربانی ڕێبازەکەت دەکەین، پاشان سەیری پێغەمبەری خوای کردوو فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا من شەهیدم؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: من شایەتیت بۆ دەدەم کە شەهیدیت.

پاش ئەم مژدەیەی پێغەمبەر (ﷺ) (عوبەیدە) گیانی پاکی سپارد (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

لە دیمەنی موبارەزە تاکە کەسییەکەدا، (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە) کە یەکێك بوو لە موبارەزەکان کوژرا، (عوتبە) باوکی (ئەبو حوذیفە) بوو، کەگەنجێکی ئازاو

دلێری مسوڵمانان بوو، بە چاوی خۆی کوژرانی باوکی و براکەی و مامی بینی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای تەواو بوونی جەنگ فەرمانی دا هەموو تەرمەکانیان لە چاڵەکەی (قلیب)دا بنێژن، لەو کاتەدا سەیری (ابو حذیفە)ی کرد، تێبینی کرد ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو تێکچوو بوو.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (أبو حذیفە) دەڵێی لە بارەی باوکتەوە شتێکت بۆ دروست بووە؟

لەوەڵامدا فەرمووی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، سوێندت بۆ دەخۆم، لە مردنی باوکمدا هیچ گومانێکم بۆ دروست نەبووە، بەڵام باوکم جۆرە پیاوەتی و داناییەکی تێدابوو ئومێدم دەکرد خوا هیدایەتی بدات و مسوڵمان بێت، بەڵام کاتێك بینیم کوژراو بەکافری مرد، ئەو ئاواتەم نەهاتەدی و بێتاقەتی کردم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بەسەر شانیدا هێناو دوعای خێری بۆ کرد.

جێگەی سەرنجە کە لێرەدا بڵێین: کاتێك موشریکان لەسەرەتای موبارەزەکەوە دێنە دەرەوە (أبو حذیفە) سەیردەکات ئەوانە هاتوونەتە دەرەوە بریتین لە: باوکی و مامی و براکەی، ئەمیش گوڕێك دەداتە خۆی و حەزدەکات یەکێك لە موباریزە مسوڵمانەکان خۆی بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناهێڵێت، ئەمەش بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەو خۆشەویستییەی (أبو حذیفە) بۆ ڕێبازی خواو پێغەمبەری مەزن هەیەتی (ﷺ).



ئینجا (ئیبن ئیسحاق) لە موحەمەدی کوڕی جەعفەرو ئەویش لە مامی خۆیەوە کە (عوروەی کوڕی زوبەیر)ە دەگێڕێتەوە: جارێکیان عومەیری کوڕی وەهەبی جەمەحی لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەیدا دانیشتبوون، (کات دوای جەنگی بەدرو کوژرانی سەرانی قوڕەیشە) عومەیر کابرایەکی داخ لە دڵو فێڵبازی قوڕەیش بوو، زۆر ئازاری پێغەمبەری خوا دەداو هاوەڵانیشی بێزار کردبوو.

له جەنگی بەدردا کوڕەکەی لەلایەن مسوڵمانەکانەوە دەستگیر کرابوو، صەفوان لە دانیشتنەکەیدا داخ و ئەسەفێکی زۆری خوارد، بۆ کوژراوەکانی (قولەیب)، صەفوان هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی: بەڕاستی ژیان دوای ئەوان هیچ خێرێکی تێدا نییە.

عومەیر وتی: وەڵلاهی راست دەکەیت، سوێند بێت ئەگەر قەرزاری ترسی ماڵو منداڵ نەبوایە ئێستا سوار دەبووم و دەڕۆیشتم بۆ مەدینەو (محمد)م دەکوشت، بەتایبەتی کە ئێستا کوڕێکم لای (محمد) دیلە، بەو بۆنەیەوە دەتوانم بگەمە ئەویٚ.

صەفوان ئەمەی بە هەلێکی باش زانی وتی: بە نیسبەت قەرزەکەتەوە من بۆت دەبژێرم، خەمی ماڵو منداڵەکەشت مەخۆ، من ژیانیان بۆ دابین دەکەم هەتا دەگەڕێیتەوە.

عومەیر بەمە رازی بوو، وتی: بەڵام تکات لێدەکەم با ئەم مەسەلەیە نهێنی نێوان من و تۆ بێت و کەس پێی نەزانێت.

صەفوان وتی: باشە منیش رازیم.

عومەر شمشێرەکەی تیژکردەوەو ژەهراوی کردو بەرەو مەدینە کەوتە ریٚ.

لە ناو شاری مەدینەدا ژیان ئاسایی بوو، عومەری کوڕی خەتتاب و هەندێك لە هاوەڵان پێکەوە راوەستابوون و باسی شەڕەکەی بەدرو فەزڵو نیعمەتەکانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیان دەکرد، عومەر (رەزای خوای لیٚ بێت) لە دوورەوە (عومەیری کوڕی وەهەب)ی بەدی کرد، بە سواری وشترێکەوە شمشێرێکی لە قەدی خۆی داوە، خەریکە لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا دادەبەزێت.

عومەر هاواری کرد: ئەو پیاوە خراپە بگرن و نەهێڵن دەربچێت، سوێند بێت بۆ کارێکی خراپ هاتووە، ئەمە ئەو پیاوەیە کە لە جەنگی بەدردا خەڵکی لە دژی ئێمە کۆدەکردەوە،

پاشان عومەر بە پەلە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە دوژمنی خوایە، نیازی خراپە، شمشێرەکەی بە دەستەوەیە!.

پێغەمبەری خوا بە هێمنیەوە فەرمووی: بۆم بکەنە ژوورەوە، ئینجا عومەر (ﷺ) شمشێرەکەی خۆی لە گەردنی (عومەیر) ئاڵاندو بە کۆمەڵێك لە ئەنصارییەکانی تری وت: ئێوەش ئاگاداربن، ئەمە پیاوێکی خراپەونە بادا بیەوێت دەستێك لە پێغەمبەری خوا بوە شێنێت.

بەو شێوازە بردیانە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە بەردەمیدا دایان نیشاند، هێشتا عومەر شمشێرەکەی لەسەر گەردنی عومەیر لانەبردبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عومەری فەرموو: شمشێرەکەت دوور خەرەوە، ئینجا رووی کردە عومەیرو پێی فەرموو: عومەیر لێم نزیك بەرەوە، عومەیر لێی نزیك بووەوەو وتی: بەیانیت باش.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەمە سلاوی سەردەمی جاهیلییە، خوای گەورە بە سلاوێکی جوانتر ریزداری کردووین، ئەو سلاوەی ئێمە لە هی تۆ باشترە، سلاوەکەی ئێمە سلاوی خەڵکی بەهەشتە.

عومەیر وتی: ئەم سلاوەی ئێوە بە نیسبەت منەوە تازەیە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە؟

عومەیر وتی: بۆ ئەوە هاتووم لەگەڵ کوڕە دیلەکەمدا باش بن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەو شمشێرەی گەردنت بۆ چییە؟

عومەیر وتی: خوات لە ناوی بەرێت، جا ئەم شمشێرە چی بۆ ئێمە کردووە!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: راستم پێ بڵێ بۆچی هاتوویت؟

عومەیر وتی: تەنها بۆ ئەوە هاتووم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: نەخێر عومەیر، بەڵکو تۆو صەفوانی کوڕی ئومەییە لە (حجر) دانیشتبوون، یادی کوژراوەکانی (قلیب)تان دەکرد،

تۆش وتت: ئەگەر قەرزم لەسەر نەبووایەو مندالّی زۆرم نەبوایە هەر ئێستا هەڵدەستام و دەچووم (محمد)م دەکوشت، ئەوە بو صەفوان قەرزو ژیانی مندالّەکانتی لە ئەستۆی خۆی گرت و تۆش هاتیت من بکوژیت، بەلاّم دلّنیابە کە خوا هەرگیز ناهێڵێ هیچم بەسەردا بێت.

عومەیر لەبەردەم ئەم دیمەنە سەراسیمەیەدا سەرسام بوو، تێگەیشت کە بەڕاستی ئەم هەواڵە لە خواوە دراوە بە پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە شایەتومانی هێناو مسوڵمان بوو، پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە زۆر خراپ بووین کاتێك وەحی بۆ تۆ دەهات بە درۆمان دەخستیتەوە، ئەم هەواڵەش یەکێکە لە هەواڵەکانی وەحی، دەنا لەو کاتەدا کە من قسەم لەگەڵ صەفواندا دەکرد تەنها خۆمان بووین وکەسمان لەگەڵ نەبوو، سوێند بێت بە خوا من ئێستا بڕوای تەواوم بە پێغەمبەرێتی تۆ هەیەو سوپاسی خوا دەکەم کە تا ئێرە ملی ڕێی پێگرتووم و هیدایەتی داوم.

پێغەمبەر (ﷺ) رووی کردە هاوەڵان و فەرمووی: براکەتان فێری ئاینەکەی بکەن و قورئانی پێ بخوێننەوەو دیلەکەشی بۆ بەرەڵا بکەن.

عومەیر وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا ئێستا لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە نووری خوا بکوژێنمەوە، ئازاری مسوڵمانانم زۆر دەدا، بۆیە حەزدەکەم مۆڵەتم بدەیت بگەڕێمەوە ناو کەس و کارم و بەرەو ئیسلامەتی بانگیان بکەم، بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات یان ئازاریان بدەم هەروەکو چۆن ئازاری هاوەڵانی تۆم دەدابۆ ئەوەی پەشیمانیان بکەمەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی دا کە بگەڕێتەوە بۆ مەککە، لەو لاشەوە صەفوانی کوڕی ئومییە خۆش خۆش هەواڵی دەدا بە قورەیش و دەیوت: لەم چەند رۆژەدا هەواڵی خۆش دەبیستن، ئەوەندە خۆشە خەفەتی جەنگی بەدرتان لەبیر دەباتەوە.

صەفوان بە حیسابی خۆی نەخشەکەی مەحکەم دارشتبوو، چاوەڕوانی هەواڵی کوشتنی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، بۆیە هەرکەسێك لە مەدینە بهاتایەتەوە هەواڵی عومەیری لێ دەپرسی، هەتا جارێکیان هەواڵیان دایە کە مسوڵمان بووە!، صەفوان خەریك بوو ئەقڵی لە دەست بدات، بۆیە سوێندی خوارد نە قسە لەگەڵ عومەیردا بکات و نە یارمەتی ماڵو منداڵەکەی بدات. کاتێك (عومەیر) گەیشتەوە مەککە دەستی کرد بە بانگەشەکردن بۆ ئیسلامەتی و ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەسەر دەستی مسوڵمان بوون.

## دیداری دوانزەهەم

## هەڵۆیەك خەمی مەزن

جەنگی ئوحود لە یادگارییەکانی مسوڵمانان یادێکی ناسۆرو برینێکی ساڕێژ نەبووە، لەو جەنگەدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان بەهۆی هەڵەی هەندێکیانەوە شەهید کران و شکستێکی سەربازی گەورە بەسەر مسوڵماناندا هات.

هەر لەو جەنگەدا بوو (حەمزە)ی مامی پێغەمبەری (ﷺ) شەهید کراو زامێکی قوڵی لە ناخی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەجێهێشت. لە کاتی شەڕەکەدا زۆربەی خەمی هاوەڵان ئەوە بوو کە ئایا پێغەمبەری خوا چی لێ بەسەرهاتووە، بۆیە مێژوو هەندێك هەڵوێست و بۆ تۆمارکدووین کە نیشانەی خۆشەویستییەکی راست و قوربانی دانی مەزنە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ). لەم دیمەنەدا چەند هەڵوێستێکتان بۆ هەڵدەبژێرین...

(طەلحەی کوڕی عوبێدوڵلا) لە رۆژی جەنگی ئوحوددا زۆر ئازایانە دەجەنگا، بە شمشێرەکەی دەستی بەرگریەکی سەختی لە پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ)، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهەر چوارلادا سەیری دەکرد (طەلحە)ی دەبینی شەڕ دەکات و ناهێڵێت کەس لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)نزیکبێتەوەو، خۆی کردبووە قەڵغانی بەرگری و هەرچی شیرو تیرو رمێك رووی دەکردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو خۆی دەدایە بەری و بریندار دەبوو، لە یەکێك لەوجارانەدا یەکێك لە موشریکەکان تیرێکی هاویشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، (طەلحە) ئاگای لێ نەبوو، خێرا خۆی فڕێدایە بەردەمی پێغەمبەرو تیرەکەی بەرکەوت، دەستێکی بەتەواوەتی بریندا بوو، لە ئاکامیشدا ئیفلیج بوو.

لە کاتێکدا کە مسوڵمانان لە شەڕەکەدا پاشەکشەیان دەکرد (شەیبەی کوڕی مالیك) لە ریزی موشریکەکاندا بوو، بە سواری وڵاخێکەوە هاواری دەکرد:

(محمد)م پێ نیشان بدەن هەر ئێستا دەیکوژم، (طەلحە) لەسەری ئامادە بوو، شمشێرێکی دا لە چوار پەلی ئەسپەکەی و (شەیبە) کەوتە خوارەوە، ئینجا کەوتە سەری‌و کوشتی.

لەو جەنگە خوێناوییەدا (طەڵحە) سەری لە چەند لایەکەوە بریندار بووبوو، جگە لە دەست و چەند ئەندامێکی تری. برینەکانی زۆر بوون، تا لە ئاکامدا لەهۆش خۆی چوو، ئەبوبەکر (ﷺ) هەندێك ئاوی بەسەردا کردو هۆشی بەبەردا هاتەوە، یەکەم وشەی دوای بێداربوونەوەکەی ئەوە بوو: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی لێ بەسەر هات؟

ئەبوبەکر پێی وت: سەلامەتە خەمت نەبێت، هەر ئەویش منی نارد بۆ لای تۆ، (طەڵحە) وتی:سوپاس بۆ خوا، هەموو کارەساتێك دوای پێغەمبەری خوا ئاسانە.

ئیبن ئسحاق دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا دوای شەڕەکە لە شیوێکدا خۆیان حەشاردابوو، موشریکەکان ویستیان سەری شاخەکەیان لێ بگرن، عومەری کوڕی خەتاب و هەندێك لە هاوەڵان بۆیان چوون و نەیان هێشت، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ویستی بڕواتە سەر بەردێکی شاخەکەو سەیرێکی گۆڕەپانی جەنگەکە بکات، ئەوەندە شەکەت بووبوو نەیدەتوانی هەستێتەوە، خێرا (طەڵحە) نەویەوەو چووە ژێر باڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرزی کردەوە، هەتا بەتەواوی راست بووەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:(أوجب)، واتە (لەپای ئەوەدا کە (طەڵحە) بۆ پێغەمبەری خوای کرد بەهەشتی حاصڵ کرد)، پاشان پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەرکەسێك دەیەوێت سەیری مرۆڤێکی بەهەشت بکات... با سەیری (طەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا) بکات.



(ئەنەسی کوڕی نەضر) کە یەکێکە لە هاوەڵان، جەنگی بەدری نە بینی بوو، گوێی لێ بوو ئایەتی لێخۆش بوونی خوایی بەسەر بەشدارانی جەنگی بەدردا دەخوێندرایەوە، دەیوت: سوێند بێت ئەگەر جەنگێکی تر رووبدات خوا خۆی دەزانێت چی دەکەم.

کە جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە، بە پەلە لە مەیدانی جەنگدا دەهات و دەچوو هاواری دەکرد: لە پەنا شاخی ئوحودەوە بۆنی بەهەشت دەکەم، دەنگە دەنگێك پەیدابوو، (ئەنەسی کوڕی نەضر)هاتە لای (عومەری کوڕی خەتتاب)و (طلَحەی کوڕی عوبەیدوڵلا)و کۆمەڵێك کۆچەری تریشیان لەگەڵدا بوو بەتەواوی پشتیان سارد بووبوەوە، وتی: ئەوە بۆچی سارد بوونەتەوە؟

وتیان: چونکە پێغەمبەری خوا شەهید کراوە!

ئەویش هاواری لێکردن: دوای پێغەمبەری خوا ئیتر ئێوە ژیانتان بۆ چییە؟ هەستن لەو پێناوەدا بمرن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری شەهید بوو.

هەموویانی گەرم کردەوەو خۆشی کەوتە هەڵمەت بردن و خۆی کوتایە ناو سوپای موشریکەکانەوە، لە ئەنجامدا شەهید کرا... کە جەنگ تەواو بوو مسوڵمانان چوون لاشەی شەهیدەکانیان کۆبکەنەوە، کاتێك چوونە سەر لاشەی (ئەنەس) نەیان ناسیەوە، زیاتر لە حەفتا برینی جێگە شیرو تیرو رمی پێوە بوو، بەڵام کاتێك خوشکەکەی هاتە سەری بە ئەڵقەکەی دەستی ناسییەوە، رەزاو رەحمەتی خوا لە ئەنەسی کوڕی نەضر.

پاش ئەوەی جەنگی ئوحود کۆتایی هات، مسوڵمانان هەریەکەو بەسەر ونبووەکانی خۆیاندا دەگەران، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کێ لە ئێوە دەتوانێت هەواڵێکی (سەعدی کوڕی رەبیع)م بۆ بزانێ؟ تا بزانم ماوە یان مردووە؟

محەمەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری هەستاو کەوتە گەڕان بەناو کوژراوەکانداو هاواری دەکردە سەعدو دەیوت: ئەی سەعد ئایا ماویت؟ چەند

جار دووپاتی کردەوە هیچ وەڵامێك نەبوو، چەند جارێکی تر بە دەنگی بەرز هاواری کردەوە: ئەی سەعد من پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردوومی هەواڵت بزانم لە کوێیت، وەڵامم بدەرەوە.

ئینجا لە پەنایەکەوە گوێی لە دەنگێکی نزم بوو، دەنگی سەعد بوو وتی: ئەوەتام لێرەدا.

محەمەدی کوڕی مەسلەمە سەیری کرد بە بریندار لە نێوان کوژراوەکاندا کەوتووەو دواساتەکانی ژیانی ماوە، پێی وت: پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم کە هەواڵت بزانم ماویت یان نا؟

سەعد وتی: من لە ناو مردووواندام، داوات لێدەکەم سڵاوو رێزم بگەیەنە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێی بڵێ: سەعدی کوڕی رەبیع پێت دەڵێ: خوای گەورە لە جیاتی ئێمە پاداشتی خێرو چاکەت بداتەوە، باشترین پاداشتێك کە خوا بە پێغەمبەرێکی بدات و پێی بڵێ: کە زیاتر لە دوانزەجار بریندار کراوم و ئەوانەی لێیانداوم هەموویانم پێکاوە، هەروەها بەخێڵەکەت بڵێ: سەعدی کوڕی رەبیع سەلامتان لێدەکات و دەڵێت: ئەمڕۆ هیچ یەکێك لە ئێوە هیچ بەهانەیەکی بەشداری کردنی نییە، هەمووتا پێویستە بەشداری لە پشتیوانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن، هەتا تروسکایی چاوتان هەبێت خوا لێتان قبوڵ ناکات دەستەوستان بوەستن. ئەمەی وت و گیانی پاکی سپارد.

دوای وەفاتی سەعد، جارێکیان ئەبوبەکر منداڵێکی بچووکی سەعدی لەگەڵدا بوو، یاری بۆ دەکردو ماچی دەکرد، پیاوێك پێی وت: ئەمە منداڵی خۆتە؟

وتی: نەخێر.. بەڵکو منداڵی پیاوێکی لەمن باشترە، ئەمە منداڵی پیاوێکە (نەقیب)ی عەقەبەیە، شەڕی بەدری بینیوەو لە جەنگی ئوحوددا شەهید کراوە، ئەمە منداڵی (سەعدی کوڕی رەبیع)ە. هەزاران رەحمەت و رەزای خوا لە گیانی پاك و پیرۆزیان.

## دیداری سیانزەیەم

### هەستانەوە بە زامی جەستەوە

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی ئوحود بووەوە، لە گەڕانەوەیدا بەرەو شاری مەدینە بەلای خێڵی (بەنی عەبدولئەشهەل)دا گوزەری کرد، بۆ شەهیدەکانیان دەگەڕان، لەو خێڵەدا (أم عامر)ی ئەشهەلی هاوسەرێکی و کوڕێکی و باوکی لەو جەنگەدا شەهید بووبوون، کاتێك هەواڵەکەیان پێگەیاند بێتاقەت بوو، بەڵام کە یادیان خستەوەو دڵیان دایەوە وتی: (إنا لله وإنا إلیة راجعون)، پاشان وتی: تو خوا پێم بڵێن پێغەمبەری خوا سەلامەتە یان نا؟

وتیان: سوپاس بۆ خوا سەلامەتە، بەوشێوەیەیە کە تۆ پێت خۆشە.

وتی: پێم پیشان بدەن بۆ ئەوەی سەیری کەم.

ئاماژەیان بۆ کردو ئەویش بینی کەسەلامەتە، ئینجا وتی: بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوا هەموو کارەساتێك دوای تۆ ئاسانە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعاو نزای زۆری بۆ کرد.



(کەبشەی کچی رافیع) کە دایکی (سەعدی کوڕی مەعاذ)بوو، بە راکردن و هەناسە بڕکێ تاوی خۆی دابوو بەرەو لای پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر ئەسپەکەی بوو، سەعدی کوڕیشی جڵەوی ئەسپەکەی بۆ گرتبوو، سەعد بە پێغەمبەری وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە دایکمە بەرەو ئێرە دێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: مەرحەبات لیٚ بێت و سەرچاوم هات.

دایکی سەعد نزیك بووەوەو ورد راما لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا بەباشی دڵنیابوو کە خۆیەتی، ئینجا رووی گەشبووەو ئاهێکی حەوانەوەی هەڵکێشاو وتی: ئیتر موصیبەتی من ئاسان بووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵی دایەوە، کە کوڕەکەی شەهید بووە، بەناوی (عەمری کوڕی مەعاذ)ەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دایکی سەعد! مژدە بدەو مژدەش بدە بە کەس و کاری شەهیدەکانی تریش، کە شەهیدەکانیان ریزیان بەستووەو بەرەو بەهەشت بەڕێکەوتوون.

(أم سعد) وتی: ئێمە هەموومان بە تۆ رازین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمڕۆ بەدواوەش کەسمان بۆ مردووان ناگرین، کێ هەیە دوای ئەو مژدە خۆشانە لەسەریان بگری. پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! تکات لێدەکەم کە دوعایەکیش بۆ زیندووانمان بفەرموو.

ئەویش (ﷺ) فەرمووی: خوایە خەمی دڵەکانیان بڕەوێنەوەو برینی ئەم کارەساتەیان بۆ ساڕێژ بکەیت و نەوەکانی دوای ئەمانیش بۆ خۆت بصوڵحێنی با چاکترین پاشینەی باوکیان بن.



واقدی دەڵێت:

ڕۆژێك دوای جەنگی ئوحود، پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی هەینیدا گەیشتە شاری مەدینە، لە ڕۆژی یەك شەممەدا پاش ئەوەی نوێژی بەیانیان کرد، پیاوانی (ئەوس و خەزرەج) لە مزگەوتدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) مابوونەوە. لە بەر دەرگایماڵەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) (سەعدی کوڕی عوبادەو حەبابی کوڕی مونذرو سەعدی کوڕی مەعاذو ئەوسی کوڕی خەولی و قەتادەی کوڕی نەعمان)و چەند کەسێکی تر وەستا بوون، پاش ئەوەی کە نوێژی بەیانی تەواو بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بیلالی فەرموو کە هاوار بکاتە خەڵکی و بڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) داواتان لێدەکات دوای دوژمنەکانتان بکەون، هەرکەسێك لە جەنگی ئوحوددا بەشداری نەکردووە با لەگەڵمان نەیەت.

که دەنگی بیلال بە هەموو شاردا بڵاو بۆوە، ئیتر کوچەو کۆڵانەکانی مەدینە دەنگە دەنگ و تەپەی پێی هاوەڵانی تێکەوت، کە بەپەلە بەرەو مزگەوت رایان دەکرد، بۆ ئەوەی بەدەم هاواری پێغەمبەرەوە بچن.

جێگەی سەرنجە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆی برینداربوونەوە زۆریان لە جێگەدا کەوتبوون، (سەعدی کوڕی مەعاذ) کە چوو خێڵی (بني عبدالأشهل) ئاگادار بکاتەوە، بریندار لە زۆربەیماڵەکاندا هەبوون.

سەعد هاواری کرد: ئەی خێڵی (بني عبدالأشهل) پێغەمبەری خوا (ﷺ) داواتان لێدەکات دوای دوژمنەکانتان بکەون، دەست بەجێ (ئەسیدی کوڕی خضیر) کە لەو کاتەدا برینەکانیان بۆ دەپێچاو حەوت برینی پێوە بوو هەستایە سەرپێ‌و چەکەکەی هەڵگرت. برینەکانی نەپێچایەوەو بەدەم رێگاوە دەیوت: ئێمە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خواین. خێرا گەیشتە پێغەمبەری خوا هەندێکی تر لە لایەکەو وەستابوون کە هەموویان بریندار بوون.

سەعدی کوڕی عوبادەش خێڵی (بەنی ساعیدە) کەس و کاری ئاگادار کردەوە، کە خێرا دەچنە دەرەوەو بە دەم بانگەوازەکەی پێغەمبەری خواوە بچن، ئەوانیش هەموویان لە ماڵ دەرچوون و بەدەم بانگەوازەکەی پێغەمبەری خواوە چوون.

ئەبو قەتادە هاتە لای خەڵکی ناوچەی (خەربی)و وتی: پێغەمبەری خوا داواتان لێدەکات کەبگەنە لای و بڕۆن بۆ راوە دوونانی دوژمنەکانتان، هەموویان هەڵمەتیان بردو چەکەکانیان لە شان کردو کەوتنە رێ، هەر هەموویان برینیان پێوە بوو.

لە خێڵی بەنوو سەلەمە (٤٠) بریندار لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کەوتە رێ، لەوانە (طوفەیلی کوڕی نەعمان) کە نۆ برینی پێوەیوو، (خەراشی کوڕی صوممە) دە برینی پێوەبوو، (کەعبی کوڕی مالیك) سیانزە برینی پێوەبوو، (قوطبەی کوڕی عامر) نۆ برینی پێوەبوو، هەمووی بەڕێکەوتن هەتا گەیشتنە

**پێغەمبەری خوا لەوێدا ریز بوون، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموویانی بینی سەرو دەست و قاچ و جەستەیان بەهۆی بیرنەوە پێچرابوو، خوێنیان لێدەتکا... فەرمووی: (أللهم ارحم بني سلمة) واتە: خوایە رەحم بە خێڵی بەنی سەلەمە بکەیت.**

دیداری چواردەهەم

## خیانەت

لە مانگی (صەفەر)ی ساڵی چوارەمی کۆچیدا (ئەبورەزای کوڕی مالیك) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).پێغەمبەری خوا باسی ئیسلامی بۆ کرد، کابرا مسوڵمان نەبوو، لە ئیسلامیش دوور نەکەوتەوە، پاشان وتی: بۆچی هەندێك لە هاوەڵانی خۆت نانێریت بۆلای خەڵکی (نەجد) بانگیان بکەن، کێ دەڵێت مسوڵمان نابن؟!

پێغەمبەری خوا فەرمووی: دەترسم خەڵکی نەجد کارەساتێك بەسەر هاوەڵانمدا بهێنن.

(ئەبو بەڕاء) وتی: لەوەیاندا خەمت نەبێت، من دراوسێیانم، با هاوەڵانت بێن و خەڵکی بانگ بکەن و لە پەنای مندا دەبن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چل کەسی خوێندەواری ئامادەکردو (مونذری کوڕی عامر)ی کرد بە سەرۆکیان و ناردنی بۆ نەجد، ئەوانیش کەوتنە ڕێ هەتا گەیشتنە ناوچەی (بیری مەعونە)، ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نێوان زەوییەکانی بەنی عامرو بەنی سەلیمەوە، کە لەوێ نزیك بوونەوە (حەرامی کوڕی موسلم)یان ناردو نامەیەکیان دایە بیگەیەنێت بە (عامری کوڕی طوفەیل)، کاتێك گەیشتە لای و نامەکەی دایە، عامر سەیری نامەکەی نەکرد، فەرمانیدا دەست بەجێ حەرامی کوڕی موسلیمیان شەهید کرد، پاشان هاواری کردە خێڵی بەنی عامر هەتا بێنم بە هاوارییەوە، کەس نەهات و وتیان: ئێمە نامانەوێت ڕووی (ئەبو بەڕاء)ی هاوپەیمانی خۆمان زەرد بکەین، چونکە بەڵێنمان داوەتێ کە ئەوان لە پەنای ئەودا بن و کەس دەستیان بۆ نەبات.

عامری دوژمنی خوا کە زانی لەگەڵ بەنی عامردا هیچی پێ ناکرێت، ناچار هاواری کردە خێڵەکانی بەنو سەلیم کە پێك هاتبوون لە هۆزی (عصیە)و (رعل)و (ذکوان)، ئەوان هەموویان هاتن بە دەمییەوەو ژمارەیەکی زۆریان

چەكدار كۆكردەوەو گەمارۆی هاوەڵەكانی پێغەمبەریان دا، هاوەڵانیش كە زانیان گەمارۆ دراون تەسلیم نەبوون، شەڕیانكرد هەتا هەموویان شەهید كران، تەنها (كەعبی كوڕی زەید) نەبێت، كە بە برینداری بەجێیان هێشبوو، چونكە وایان دەزانی دەمرێ لە دواییدا چاك بووەو لە جەنگی خەندەقدا شەهید كرا، لە كاتی ئەو شەڕەدا دووان لەو هاوەڵانە كە (عەمری كوڕی ئومەییەو مونذری كوڕی محەمەد) بوون لەگەڵ ئەواندا نەبوون و لە سەربازگەكەیان دوور كەوتبوونەوە، ئاگایان لەم شەڕە نەبوو، كاتێك گەڕانەوە سەیر دەكەن قەل و داڵ بەسەر سەربازگەكەدا دێت و دەچێت، هەرلە دوورەوە وتیان: سوێند بێت شتێك قەوماوە، وەگەر نا ئەو هەموو قەل و داڵە بە ئاسمانی سەربازگەكەوە چی دەكەن؟!

كاتێك گەیشتنە جێ سەیردەكەن هاوەڵانیان خەڵتانی خوێن كردوون و شەهید كراون.

عەمر وتی: من پێم باشە بگەینە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵەكەی بدەینێ.

مونذر وتی: نەخێر من حەزناكەم بە زیندوویی بگەڕێمەوە لەكاتێدا هەموو هاوەڵەكانمان شەهیدكرابن، بۆیە خێرا شمشێرەكەی هەڵكێشاو هەڵمەتی برد بۆ ناو دوژمن، پاش كەمێك ئەویش شەهیدكرا. جەباری كوڕی سولمانی كوڕی مالیك كە لەوكاتەدا موشریك بوو، لەو شەڕەدا بەشداری كردبوو لەگەڵ (عامر)داو دەڵێ: لەو شەڕەدا بە ڕمەكەی دەستم هەردوو دەفەی شانی یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرم سمی، نووكی رمەكەم لە سنگییەوە دەرچوو، گوێم لێ بوو هاواری كردو وتی: سوێند بێت بەخوا سەركەوتنم بەدەست هێنا، لە كاتێكدا من ئەوم كوشت، دوای ئەو پرسیارم لە یەكێك كردو پێی وتم: مەبەستی شەهادەت بووە لەپێناوی خوادا... بۆیە ئەم قسەیە زۆر كاری تێكردم وتم: سوێند بێت بە خوا راستی كرد، ئەو سەركەوت و من ژێركەوتم... لە

دواییدا دڵم هەر ئارام نەبووەوە هەتا مسوڵمان بووم و هاتمە ریزی مسوڵمانانەوە.



جارێکیان کۆمەڵێك لە خێڵی (عضل)و (قارە) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و پێیان وت: پێغەمبەری خوا ئیسلامەتی لە نێوانماندا بڵاو بۆتەوە، هەندێ لە هاوەڵانی خۆتمان لەگەڵدا بۆ بنێرە بۆ ئەوەی فێری ئیسلامەتیمان بکەن و قورئانمان پێ بخوێنن و شەریعەتی ئیسلاممان فێربکەن.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) شەش کەس لە هاوەڵانی خۆی لەگەڵ ناردن، کە بریتی بوون لە (مرثدی کوڕی مرثدی غەنەوی)و (خالیدی کوڕی بوکەیر)و (عاصمی کوڕی ثابت)و (خوبەیبی کوڕی عەدی)و (زەیدی کوڕی دەثینە)و (عەبدوڵلای کوڕی طارق).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) (مرثد)ی کرد بە سەرۆکیان و بەڕێکەوتن، هەتا گەیشتنە ناوچەی (الرجیع) کە کانیاوێکی موڵکی (هذیل)بوو لە ناوچەی حیجازدا، لەو جێگەیەدا ئەوانە بەڵێنیان پێدابوون، خیانەتیان لێکردن و خێڵی (هذیل)یان هێنایە سەریان، ئەمان هێشتا لە ناو جێگەکانی خۆیاندا بوون، خێڵی (هذیل)هەڵیان کوتایە سەریان و پەلاماریاندان، ئەوانیش بە ناچاری شمشێریان لێ هەڵکێشان و کەوتنە بەرگری لە خۆ کردن، موشریکان کەهاتنە سەریان پێیان وتن: نامانەوێ بتان کوژین، بەڵکو دەمانەوێت تەسلیم بە خەڵکی مەککەتان بکەین و شتێکتان پێ وەربگرین، بەڵێنیشتان دەدەینێ کە نەتان کوژین.

لەبەرامبەر ئەم خیانەتەی خێڵی (هذیل)دا هەرسێ هاوەڵان (مرثد)و (خالید)و (عاصم) وتیان: ئێمە هیچ متمانەمان بە وەعدو پەیمانی موشریکان نییەو باوەڕتان پێناکەین، بۆیە کەوتنە موقاوەمەت و بەرگری کردن و لە ئاکامدا هەرسێکیان شەهید کران.

خێڵی (هذیل) دوای شەهید کردنی ئەم سیانە ویستیان سەری (عاصم) لە لاشەی جیابکەنەوەو بیفرۆشن بە (سولافەی کچی سەعد) لە مەککە، چونکە دوو کوڕی موشریك بوو، کە لە جەنگی بەدردا کوژرابوون، سوێندی خواردبوو کە ئەگەر سەری (عاصم)ی بەدەست بکەوێت، لە کەللە سەرەکەیدا ئاو بخواتەوە، خێڵی (هذیل)یش بەمەیان دەزانی و دەیان ویست پارەو پولێکێیان لە سولافە دەست بکەوێ.

بۆ ئەو مەبەستە هاتن و ویستیان سەرەکەی لە لاشەکەی جیابکەنەوە، خوای گەورە بۆ ڕێزگرتن لە جەستەی بەڕێزی کۆمەڵێکی زۆر لە زەردەواڵەی ناردەسەری کەس نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە، لە بەینی خۆیاندا وتیان: وازی لێبهێنن بۆ شەو کە زەردەواڵەکان ڕۆیشتن دێینەوە سەری، بە ویستی خوای گەورە شەو تۆف و ڕەهێڵە دەستی پێکرد، ئەو شیوەی لاشەکانی تێدا کەوتبوو بەر لافاوی زۆر کەوت و لاشەکانی لەگەڵ خۆیدا ڕاماڵی و جەستەی عاصم ونبوو.

شایەنی باسە عاصمی کوڕی ثابت کە مسوڵمان بووبوو، دوعایەکی کردبوو کە لاشەکەی نەبەزیندوویی نەبەمردوویی نەکەوێتە دەستی موشریکان.

عومەری کوڕی خەتتاب هەرکاتێك باسی پارێزگاری عەبدی ئیماندارانی بکردایە نموونەی (عاصمی) دەهێنایەوە کە چۆن لە ژیاندا خۆی لە موشریکان پاراست و لە پاش مردنیشی خوای گەورە خۆی پاراستی.

پاش ئەم بەسەرهاتە خێڵی (هذیل)یەکان توانییان (زەید)و (خوبەیب)و (عەبدوڵلای کوڕی طارق) بە دەستی بگرن و بەرەو مەککەیان بەرن، بەڵام کاتێك گەیشتنە ناوچەی (مر الظهران) (عبدوڵلای کوڕی طارق) توانی پەتەکەی دەستی بکاتەوەو دەست بداتە شمشێرێك و دەست لە موشریکان بکاتەوە، بەڵام ئەوان زۆربوون هەرلەوێدا بەرد بارانیان کردو شەهیدیان کرد. کە

گەیشتە مەککە (صەفوانی کوڕی ئومەییە) (زەید)ی کڕی بۆئەوەی لە تۆڵەی کوژرانی (ئومەییە)یباوکیدا بیکوژێتەوە.

(زەید) لەو دەمەدا کۆتکرابوو، هێنایانە دەرەوە بۆ ئەوەی شەهیدی بکەن، بردیان بەرەو ناوچەی (تەنعیم)و کۆمەڵێکی زۆر گەنجی قورەیشی لە دەوری کۆبوونەوە، (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب)یش لەوێدا وەستابوو، لە (زەید) نزیک بووەوەو پرسیاری لێکردوو پێی وت: (زەید) سوێندت دەدەم بەخوا ئایا ئێستا حەزت دەکرد (محمد) لە جیاتی تۆ بێت لە ملی بدرێ‌و تۆش لەناو ماڵو منداڵی خۆتدا بیت؟

زەید لە وەڵامدا وتی: سوێند بێت بەخوا حەز ناکەم ئێستا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شوێنەکەی خۆیدا تەنها یەك دڕك بچێت بە پێیداو منیش لەناو ماڵی خۆمدا بە سەلامەتی دابنیشم.

لەوێدا ئەبو سوفیان وتە بەناوبانگەکەی خۆی وت: بەڕاستی لە ژیانمدا هیچ کەسێکم نەدیوە کەسێکی تری خۆش بوێت، ئەوەندەی هاوەڵانی (محمد) محەمەدیان خۆش بوێت. پاشان بردیانە سەر پەتی سێدارەو شەهیدیان کرد.

## دیداری پانزەهەم

## دوو ڕوویەك و ئیماندارێك

لە مانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی بۆ هات کە خێڵی (بني المصطلق) دەیانەوێت بەسەر شاری مەدینەدا بدەن، بۆیان چووە دەرەوەو لەسەر ئاوی (المريسيع)دا بەیەك گەیشتن، مسوڵمانەکان بەسەریاندا زاڵبوون و پەرتەوازەیان کردن.

دوای ئەوەی کە چوونە سەر ئاوەکەی (مريسيع) لە نێوان کۆچەری و ئەنصارییەکاندا دەمە قاڵێیەك دروست بوو، لە وێدا (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) دانیشتبوو، سەرکردەی مونافیقان و ئاشووبگێڕانی گەورەی شار، ویستی ئەم مەسەلەیە بقۆزێتەوەو ئاگرێکی فیتنە هەڵبگیرسێنێ، بۆیە دەنگی لێ هەڵبڕی و وتی: بەخوا جوانە... ئەم کۆچەریانە هاتنە سەر ماڵو حاڵمان و کردیانە ململانێ لە وڵاتی خۆماندا، سوێند بێت لەدوای ئەمڕۆ کە گەڕاینەوە ئەوەمان کە سەری بەرزە دەبێ ئەوەمان بکاتە دەرەوەی شار کە سەری نزم و ریسوایە. ئینجا ڕووی کردە ئەوانەی کە لە دەرەوە دانیشتبوون و پێی وتن: خەتای خۆتانە... خۆتان واتان کرد بە خۆتان، ئەمانەتان هێنایە وڵاتی خۆتان و هەموو شتێکتان لەگەڵدا دابەشکردن، سوێندتان بۆ دەخۆم ئەگەر ئێوە نەیاندەنێ ڕوودەکەنە شوێنێکی تر.

کاتێك (عەبدوڵڵا)ی دووڕوو ئەم قسانەی دەکرد، مێرد منداڵێك کە ناوی (زەیدی کوڕی ئەرقەم)بوو لەوێدا دانیشتبوو، هەستاو هەموو قسەکانی بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە، لەوکاتەدا عومەر دانیشتبوو، زۆر ڕقی هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم بدەیە تا بیکوژم؟

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شێوازێکی زۆر گەورەو کاریگەری بەکارهێنا، ئەویش ئەوە بوو خۆی ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن بەمەرجێ لەوکاتەدا هەرگیز سەفەری نەکردبوو، لەم لاشەوە کە عەبدوڵڵا بیستی زەید قسەکانی بۆ

پێغەمبەری خوا گێڕاوەتەوە، خێرا کەوتە خۆی و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)و کەوتە پاکانە کردن و ئینکاری ئەوەی دەکرد کە ئەو قسەی وای کردبێت!

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بارو بارگەیَ پێچایەوەو ویستی بڕوات، (ئەسیدی کوڕی حضیر) پەیدابوو وتی: پێغەمبەری خوا ئەمە کاتی ڕۆیشتنی جەنابت نییە بۆ هیچ کارێك، تکات لێدەکەم... خێرە بۆ کوێ تەشریف دەبەیت؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی نەت بیستووە (عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی) چی پێ وتوم؟!

ئەسید وتی: چی وتووە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی وتوویەتی: ئەگەر گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە ئەوا دەبێت پیاو ماقوڵانمان، ریسواو زەلیلەکانمان بکەینە دەرەوە!

ئەسید وتی: سوێند بێت بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ پیاو ماقوڵو سەروەری ئێمەیت و ئەوان زەلیل و ریسوان.

دوای ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی نارده خوارەوە:(هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ).

کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەیدی بانگ کردو بە ناسکی گوێچکەی گرت و فەرمووی: ئافەرین کوڕم، گوێیەکانت زۆر چاك دەبیستن!

پاشان فەرمووی: ئا ئەمەیە ئەو کەسەی هەقی گوێیەکانتی داوە.

(عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی) کاتێك هەواڵی باوکی بیست کە ئەو قسە ناڕەوایەی کردووە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و پێی وت:

ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم پێگەیشتووە کە دەتەوێت باوکم بکوژیت، چونکە دوو روویی کردووەو قسەی بە تۆ وتووە؟ سوێندت دەدەم ئەگەر نیازی شتی وات هەیە فەرمانم پێبدە با خۆم بیکوژم و سەرەکەیت بۆ بهێنم، هەموو خێڵی خەزرەجیش پیاوێکی تێدانییە لەم من باشتر بێت بۆ باوکی، ئەم هەواڵ پرسییەشم بۆ ئەوەیە نە بادا فەرمان بدەی یەکێکی تر بیکوژێت، ئینجا منیش نەفسم یاریم پێبکات و بڕۆم بکوژی باوکم بکوژمەوە، ئەوکات ئیماندارێك دەکوژم لەبری کافرێك و دەڕۆمە دۆزەخەوە.

پێغەمبەری (ﷺ) فەرمووی: نەخێر ئێمە نیازی شتی وامان نییەو چاکەشی لەگەڵدا دەکەین و هەتا لەناویشماندا بمێنێتەوە ئازاری نادەین.

ماوەیەك رابورد، مەقام و پلەی (ئیبن سەلول) سوك وریسوا بوو لە پێش چاوی خێڵەکەیو هیچ حورمەتی نەما، لە هەموو لایەکەوە خەڵکی لۆمەو سەرزەنشیان دەکردو گوێیان بە قسەکانی نەدەدا.

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە عومەری فەرموو: عومەر ئێستا چی دەڵێیت؟!، ئەگەر ئەو رۆژەی کە تۆ وتت بمان کوشتایە، دەیان کەس لەسەری هەڵیان دەدایە، هەر ئەو کەسانە ئەمڕۆ ئامادەییان تێدایە بیکوژن، بەڵام خوا خۆی کوشتی.

عومەر وتی: سوێند بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆم دەرکەوت کە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) گەلێ گەورەترو بەرەکەتدارترە لە فەرمانی من.

## دیداری شانزەهەم

## خواردنێکی پڕ بەرەکەت

(ئەنەسی کوڕی مالیك) خزمەتگوزاری ماڵەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، دەگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکیان (ئەبو طەڵحە) بە (ئوم سەلەمە)ی وت: ماوەیەکە هەست دەکەم پێغەمبەری خوا دەنگی کزبووە، وا دەزانم هۆیەکەی ماندوێتی و برسێتی بێت، ئایا شتێکت لانییە بیدەیتێ، ئەویش وتی: بەڵێ. دایکم هەستا چەند پارچە نانێکی(جۆ)مان هەبوو خستییە ناو سەرپۆشەکەی و دایە دەستم و وتی: بیبە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

منیش بردم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و سەیرم کرد لەناو سەنگەرەکاندا دانیشتووەو کۆمەڵێك لە هاوەڵانی لەدەورەو خەریکی کارن، منیش نانەکەم خستە بەردەستی و فەرمووی: ئەبو طەڵحە تۆی ناردووە؟، وتم: بەڵێ، پاشان فرمووی: بەوانەی کە دانیشتبوون: هەمووتان هەستن.

ئەنەس دەڵێت: نانەکەم هەڵگرت و ئەوان هەموو هەستان و منیش لەگەڵیاندا بەڕێکەوتم، هەتا گەیشتینە لای (ئەبو طەڵحە)و هەواڵەکەم دایە، (ئەبو طەڵحە) رووی کردە (ئوم سەلیم)و پێی وت: پێغەمبەری خواو هاوەڵان بەرەو ئێرە دێن و ئێمەش هیچمان نییە چی بکەین؟

ئوم سەلیم وتی: خەمت نەبێت خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، هەستە بەڕوویەکی گەش و دەم بە زەردەخەنەوە پێشوازی لە پێغەمبەری خوا بکە، ئەبو طەڵحە هەستاو بەگەرمی پێشوازی لە پێغەمبەری خوا کردو پێکەوە هاتنە ژوورەوەو سەلامی لە ئوم سەلیم کردو پاشان فەرمووی: چیتان هەیە بمان دەنێ با بیخۆین؟

ئوم سەلیم نانەکەی هێناو داینا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: چەوریان بکە.

ئوم سەلیم نانەکانی چەورکرد، ئینجا پێغەمبەری خوا ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو دوعای بەسەردا خوێند.

دوایی فەرمووی: با دەکەس بێنە ژوورەوە. هەموویان هاتنە ژوورەوەو لێیان خواردو بڵاوەیان لێکرد.

پاشان دە کەسی تر هاتنە ژوورەوە، ئەوانیش تێریان خواردو چوونە دەرەوە، دوای ئەو دە کەسی تر هاتنە ژوورەوە، هەموو بەتێری چوونە دەرەوە... ئەنەس دەڵێ: لەسەر ئەو سفرەو خوانە ئەو رۆژە نزیکەی (٧٠) یان (٨٠) کەس نانیان خواردوو هەموو تێربوون.



پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو جارێك دیدەنی ماڵی (ئەبو طەڵحە)ی دەکرد لە ماڵە کەیداو ئوم سەلیم راخەرێکی بۆ رادەخست تا لەسەری بحەوێتەوە، زۆربەی جار بۆ نووستنی قەیلوولە لەوێ دەمایەوە، لەکاتی خەودا ئوم سەلیم بە پارچە لۆکەیەك عەرەقی نێوچەوانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەسڕی و دەیچۆڕاندە ناو دەفرێکی تایبەتییەوە.

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەبەری بۆوەو فەرمووی: ئوم سەلیم ئەوە چی دەکەیت؟

ئوم سەلیم وتی: ئەوە عەرەقی پیرۆزی تۆیە دەمەوێت تێکەڵاوی بکەم لەگەڵ بۆنی عەترەکەی خۆمدا، چونکە بەڕاستی خۆشترین بۆنەو دەمەوێت بۆ تەبەڕوك بەکاری بهێنم.

رۆژان هات و چوو، ئەو کاتەی ئەنەسی کوڕی مالیك لە کاتی سەرەمەرگیدا بوو، وەسیەتی کرد هەندێك لەو عەرەقە بۆنخۆشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەنە ناو کفنەکەی بەرییەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك پرچێکی هێشتبۆوە، جارێکیان ویستی کورتی بکاتەوە، دایکی نەیهێشتوو پێی وت: چۆن کورتی دەکەیتەوە لەکاتێدا پێغەمبەری خوا پرچی هەبووەو کورتی نەکردۆتەوە؟!

ئەوەبو ئەنەسی کوڕی مالیك پرچەکەی کورت نەکردەوە تا کۆچی دوایی کردو لەسەر وەسیەتەکەی خۆشی بەشێك لەو عەرەقە بۆنخۆشەی پێغەمبەری خوایان کرد بە بەرگی کفنەکەیدا.

## ئیرادەی مرۆڤی ئیماندار

جولەکەو مونافیقان لە شاری مەدینەدا رۆڵی ئاشوبگێڕانەیان دەبینی و هانی قورەیشیان دەدا کە خۆیان کۆبکەنەوە بۆ هێرش بردنە سەر مسوڵمانان و لەناوبردنیان.

قورەیش بە پاڵپشتی ئەو هەموو هاندان و پشتگیرییەی کە جولەکەو مونافیقانی مەدینە دەیانکرد، خۆیان کۆکردەوە بۆ شاڵاوێکی نوێ و هەرچی هۆزو خێڵی عەرەب هەیە لەگەڵ خۆیاندا بانگیان کردبوون. لەوانە هۆزی (غەطفان)و (فزارە) کە دوو خێڵی گەورەی عەرەب بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەردەم ئەو ژمارە زۆرەدا کە هەندێك لە ریوایەتەکان دەڵێن: زیاتر لە دە هەزار چەکدار بوو. پاش پرس و راوێژ بڕیاریدا سەنگەرێکی درێژ بەدەوری مەدینەدا هەڵبکەنێ بۆ ئەوەی شارەکە لەو شاڵاوە بپارێزێت.

موحەمەدی کوڕی موسلیمی زوهەری دەڵێت: کاتێك بەڵاو کارەساتەکە لەسەر شاری مسوڵمانان گەورە بوو، ئیتر ئومێدی سەرکەوتن زۆر کەم بووەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیری کردەوە لەوەی کە سەودایەکی سیاسیانە لەگەڵ هەندێ لە خێڵەکانی هاوکاری قورەیشدا بکات بۆ ئەوەی پاشەکشە بکەن و ئەو فشارە سەختە لەسەر مسوڵمانان کەم ببێتەوە.

بۆ ئەم مەبەستە ناردی بەشوێن (عویەینەی کوڕی حەصن)و (حارثی کوڕی عەوفی موڕری)دا کە هەردووکیان دوو سەرکردەی خێڵی (غەطفان)بوون، کەوتە قسەو باس لەگەڵیان لەسەر ئەوەی کە سێیەکی بەرووبوومی مەدینەیان بدرێتێ‌و لەبەرامبەر ئەوەدا ئەوان لە سوپاکەی قورەیش پاشە کشە بکەن. بە شێوەیەکی زارەکی کۆبوونەوەکە ئەنجام دراو لەسەر ئەوە مایەوە شاهیدی لەسەر بدرێ‌و ئیمزا بکرێ، پێش ئەوەی ئەنجامی بدەن راوێژی کرد بە هەردوو

سەرکردەی خێڵی (ئەوس و خەزرەج) سەعدی کوڕی مەعاذو سەعدی کوڕی عوبادەو مەسەلەکەی بۆ باسکردن، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە کارێکەو پێت خۆشە بۆ ئێمەی ئەنجام بدەیت؟ یان ئەمە فەرمانێکی خوایەو فەرمانی پێداویت جێبەجێی بکەیت و ئێمەش هیچ ئیختیارێکی ترمان نییە؟ ئایا دەتوانین قسە لەسەر ئەم قسەیەی جەنابت بکەین؟

ئەم ئەدەبە جوانەی ئەم دوو هاوەڵە بەڵگەی حاڵی بوون و ملکەچی تەواوە لەبەردەم فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیدا، چونکە لەبەردەم (وەحی)و کەلامی پێغەمبەردا (ﷺ)هاوەڵان ڕێزو ملکەچی تەواویان نوواندووە، ئەگەر زانیبێتیان ئەوە ڕایەکەو جێگەی گفتوگۆو قسە لەسەر کردنە، پاش مۆڵەت وەرگرتن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گفوگۆیان لەسەر کردووە، بۆیە لێرەشدا ئەو پرسیارە دەکەن هەتا بزانن ئایا مەسەلەکە بواری قسەی تێدا ماوە یان نا؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموون: ئەمە مەسەلەیەکەو وەکو ڕایەکی خۆم دەیڵێم، ئێوەش بۆتان هەیە تاووتوێی بکەن، ئەم پێشنیارەشم بۆ ئەوەیە، چونکە دەبینم عەرەب لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان داون و خەمی ئەوەم لێ نیشتووە کە ئەم شارەمان لێ داگیر بکەن و بەم کارەم ویستم شەوکەتیان بشکێنم و ڕیزەکانیان پەرت و بڵاو بکەم.

ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك ئێمەو ئەوان هەردوو لامان لەسەر بیرو باوەڕی شیرك و بت پەرستی بووین، نە خوامان دەناسی و نەدەمان پەرست، ئەوانە هیچ کامیان نەیانتوانیوە دەنکە خورمایەکی ئێمە بخۆن، مەگەر بەرەزامەندی خۆمان یان کڕین و فرۆشتن، ئێستا پاش ئەوەی کە خوای مەزن بە جەنابتان ڕێزداری کردووین، چۆن ڕازی دەبین موڵکمان لێداگیر بکەن؟، سوێند بێت لەجیاتی خواردن شمشێریان دەدەینێ، هەتاکو خوا خۆی جیامان دەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەوە خواستی خۆتانەو منیش لەگەڵتانم.

پاشان سەعدی کوڕی مەعاذ بەڵێن نامەکەی لە پێغەمبەری خوا وەرگرت و هەرچی تێدا نووسرابوو سڕیەوە، ئینجا وتی: ئێمە ئامادەین با ئەوان ئازابن و بێنە سەرمان، ئەوسا خۆیان دەبیننەوە.

لە کۆتاییدا خوای گەورە ریزەکانی تێکدان و تەفرو توونای کردن، مسوڵمانانیش بەری رەنجی سەرکەوتنیان لە جەنگی (ئەحزاب)دا چنییەوە.

## دیداری هەژدەهەم

## بەخشین

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە: زەیدی کوڕی سەهل کە نازناوی (ئەبو طەڵحە)یە، لە ناو ئەنصارییەکاندا زۆر ترین باخ و بێستان و ماڵاتی هەبوو، خۆشەویسترین باخی بریتی بوو لە (باخچەی بیری جاء)، باخچەیەکی خورمای قەشەنگ بوو، بەرامبەر حەوشەی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەموو جارێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچووە ناوی‌و لە ژێر سێبەری دار خورماکانیدا دەحەوایەوەو تێر ئاوی لە کانیاوە سازگارەکانی دەخواردەوە، کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە (لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ) واتە: خێرو پاداشی خواتان دەستناکەوێت هەتا ئەو ماڵەتان خەرج نەکەن کە لەناو دڵتانا خۆشەویستە.

ئەبو طەڵحە هەستاو چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆت دەزانی کە خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردۆتە خوارەوە، منیش بیر دەکەمەوە کە باخچەی (بیری جاء) کە باخچەیەکی جوانی بەرامبەر مزگەوتەو خۆشەویسترین موڵکە لە لام، ئەوە کردم بە صەدەقەو هیوادارم ببێت بە زەخیرەی رۆژی قیامەتم لەبەردەم خوای گەورەدا، ئێستاش خۆت سەرپشك بە، لە کوێدا دای دەنێیت ئیختیاری خۆتە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەخ بەخ! بەڕاستی ئەمە ماڵێکی پڕ بەرەکەت و قازانجە، گوێت لێیە ئەبو طەڵحە، ئەوا ئێمە لێما قبولٌ کردیت و بۆ خۆتی دەگێڕینەوەو من پێم باشە بەسەر خزمانی خۆتدا دابەشی بکەیت.

(ئەبو طەڵحە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ چۆنت پێخۆشە وای لێدەکەم.

ئەوەبوو بەسەر خزمانیدا دابەشی کردو پشکێکیشی لێدا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش بەخشی بە شاعیری گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) (حەسسانی کوڕی ثابتی ئەنصاری).

## دیداری نۆزدەهەم

## بەرگی ئیحرام و دانوستانێکی مێژوویی

لە مانگی (ذي القعدة) ی ساڵی شەشەمی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەی منەوەرەوە بەرەو شاری مەککە کەوتە ڕێ ، لەو سەفەرەدا (٧٠٠) هاوەڵی لەگەڵ دا بوو،مەبەستی (عومرە) کردن بوو،بە نیاز نەبوو شەڕ لەگەڵ قورەیشدا بکات،بۆیە بەرگی ئیحرامی عومرەیان پۆشی و چەندین (هەدی)یان لەگەڵ خۆیان بردبوو،کە بریتی بوو لە (٧٠) وشتر،پێغەمبەری خوا ﷺ خەمی ئەوەی بو کە قورەیش نەیهێڵێ بڕۆنە کەعبەی پیرۆزەوە ،موسڵمانەکان شمشێرەکەیان لە کێلان دانابوو، وەکو بەڵگەیەك لەسەر خواستی ئاشتیانەیان، گەیشتنە ناوچەی (عسفان)ی نزیك شاری مەکە،لەوێدا (سوفیانی کوڕی کەعبی)هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خێڵی قورەیش زانیویانە کە تۆ دەرچوویت ئێستا ئەوانیش بە چەك و تفاقی جەنگەوە دەرچوون بەرەو ئێرە و جلی پێستی پڵنگیان پۆشیوە و لە ناوچەی (ذي طوى) دابەزیوون و سوێندیان خواردووە کە نەهێڵن بڕۆیتە نێو مەککەوە، (خالیدی کوڕی وەلید)یشیان لەگەڵدایە و هەتا ناوچەی (کراع الغميم) هاتووە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (قورەیشی بەدبەخت چی لە سایەی شەڕدا چنیوەتەوە!، ئەوەتا شەڕ خواردوونی بۆ واز ناهێنن،با پەردەی نێوان من و عەرەب بەر والا بکرێت،ئەگەر سەرکەوتن بە سەرمدا ئەوا ئاواتی قورەیش هاتۆتە دی،ئەگەر منیش سەرکەوتم بە سەری بەرزەوە ئەوانیش دێنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، ئەگەر هەر دەشیانەوێت شەڕ بکەن و بە هێز و بازووی خۆیانەوە دەنازن، ئەوە سوێند بێت بەو خوایەی منی بە هەق ناردووە شەڕیان لەگەڵدا دەکەم و جیهاد دەکەم، هەتا خوا سەرم دەخات یان ئەو قسەیەی ئەوان دەبێت.)

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە هاوەڵان کە بەرەو لایەکی تر بکەونە ڕێ، هەتا گەیشتە ناوچەی (ثنیة المرار) کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی (حدیبیه)وە.

کاتێك قوڕەیش بینیان پێغەمبەری خوا ﷺ کاروانەکەی بەرەو لایەکی تر بردووە، وایان زانی کە دەیەوێت شاڵاو بەرەو مەککە بەرێت، بۆیە بە پەلە بەرەو مەککە گەڕانەوە ،کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە (ثنیة المرار) وشترەکەی کە ناوی (قصواء)بوو، لە جێگەی خۆی نەجوولا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قصواء مانی نەگرتووە و عادەتی نییە مان بگرێت،بەڵکو کارەساتیساڵی (فیل) گرتوویەتی هەر وەکو چۆن فیلەکان لەو ساڵەدا مانیان گرت.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:ئەمڕۆ قوڕەیش بۆ من هەر نەخشەیەك بانگەشە بکات کە (سیلەی ڕەحم)و خزمایەتی تێدا بێت بە دەمیانەوە دەچم.



کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیا بوو،کابرایەك بە ناوی (بەدیلی کوڕی وەرقای خوزاعی) لەگەڵ چەند کەسێکی تری خێڵی (خوزاعە)دا هاتنە خزمەتی و قسەیان لەگەڵدا کرد و پرسیاریان لێ کرد ئەویش پێی فەرموون:کە ناهاتووە بۆ شەڕ و ئەیەوێت زیارەتی ماڵی خوا بکات و دروشمەکانی خوا بە بەرزی و بڵندی ڕابگرێت ، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ لای قوڕەیش و پێیان وتن کە محمد ﷺ بۆ جەنگ نەهاتووە بەڵکو دەیەوێت زیارەتی بەیت بکات،بۆیە قوڕەیش ئەوانیشیان دایە بەر قسە و کۆمەڵێك قسەی ناشرینیان پێ وتن. مادامەکی ئەو نەهاتووە بۆ جەنگ سوێند بێت نەهێڵین بە زۆر بێتە ژوورەوە، چونکە عەرەب بەوە بزانێت دەبینە قسە و باسیان و گاڵتەمان پێ دەکەن.

پاشان قورەیش (موکەڕەزی کوڕی حیفص)یان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی دانیشتنی لەگەڵدا بکات،پێغەمبەرﷺ هەمان وتەکانی خۆی کە بە (بەدیل)ی وتبوو، بە (موڕەکەز)یشی وتەوە،(موڕەکەز)گەڕایەوە بێ ئەوەی پێشکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنێت.

پاشان قورەیش (حلیسی کوڕی عەلقەمە)ی نارد کە کابرایەکی (ئەحابیش) بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کە لە دوورەوە بینی فەرمووی: ئەمانە کۆمەڵێکن حەزیان بە حەیوانی قوربانییە،لەبەر ئەوە لە پێش چاوی ئەودا ئاژەڵەکان بکەنە دەرەوە با بییان بینێت.

کاتێك (حلیس)ئاژەڵەکانی لە شیوەکەدا بینی،بەسترابوونەوە و لاواز ببون لەتاو بێ لەوەڕی و ماندووبوونی زۆر چروسکابوون. دەست بەجێ گەڕایەوە بۆ لای قوڕەیش و پێ ی وتن: محمد ڕێز لە بەیت دەگرێت و قوربانی هێناوە بۆ سەربڕین.

پێیان وت: تۆ کابرایەکی دەشتەکی نەزانیت، (حلیس) بەم قسەیە زۆر زویر بوو،بە قوڕەیشی وت: سوێند بێت ئێمە لەسەر ئەم قسانە پەیمانمان نەداوە بە ئێوە،چۆن ڕازی دەبین خورمەتی ماڵی خوا بشکێنرێ و ڕێزی لێ نەگیرێت!، سوێند بێت بەو کەسەی گیانی (حلیس)ی بە دەستە یان واز دەهێنن لە محمد و کۆمەڵەکەی تا بێنە ناو مەککە و عیبادەتی خۆیان بکەن،یان هەرچی کۆمەڵی (ئەحابیش)ەکان هەیە، لێتانی کۆدەکەمەوە و هێرش دەکەمە سەرتان.

قوڕەیش کە زانییان (حلیس)بە ڕاستییەتی هێمنیان کردەوە و پێیان وت: چاوەڕوان بە هەتا سبەینێ وەڵامت دەدەینەوە،هەر چۆنێك بوو (حلیس)یان ڕازی کرد کە واز لە هەڕەشەکەی خۆی بهێنێت.

(إبن هشام)دەڵێت کە (زوهری)گوتویەتی:

عروورەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی هاتە لای سەردانی قوڕەیش و پێیوتن: ئەی خێڵی قورەیش..

هەرچەند کە دەبینم نوێنەرتان دەڕواتە لای محمد و دوایی ئێوە بە قسەی ناشرین ڕەوانەی دەکەنەوە بێزار دەبم،خۆشتان دەزانن من و ئێوە وەکو کوڕ و باوك وەهاین- شایەنی باسە عروە بە بنەچە دەگەڕایەوە سەر خێڵی بەنو عەبدوشەمس- عروە وتی: ئێستا من خزم و کەسانی خۆمم بە دڵنەوای ئێوە کۆ کردۆتەوە.

خێڵی قورەیش وتیان:ڕاست دەکەیت ئێمە گومانمان لە تۆ نییە ، بۆیە کردیانە نوێنەری خۆیان و ناردیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی دانیشتنی لەگەڵدا بکات.

عروە بەرەو شاری مەدینە و خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ، گەیشتە لای پێغەمبەر و لەگەڵیاندا دانیشت ، پاشان پێی وت:ئەی محمد.. ئەم هەتییو و مەتیوە چین لە دەوری خۆتت خڕکردوونەتەوە، بەتەمایت ئەمانە بەرگریت لێ بکەن ئەوە قورەیش خۆیان کۆ کردۆتەوە و چەك و تفاقیان لە خۆیان بەستووە و پێستەی پڵنگیان پۆشیوە،سوێندیان خواردووە کە نابێت بەزۆر ئێوە بچنە ناو مەککەوە ، سوێندیش دەخۆم لەمانەی لە دەورت خڕ بوونەتەوە لە یەکەم شاڵاودا پشتت لێ هەڵدەکەن و دەورت چۆڵ دەکەن...

ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه لە پشت پێغەمبەرەوە دانیشتبوو، کاتێك کە گوێی لەم قسانەی عوروە بوو کە هەڕەشەی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد و گاڵتەی بە هەڵوێستی هاوەڵان دەکرد،ڕووی کردە عوروە و پێی وت:بڕۆ دەستت بە عەورەتی لات، چۆن ئێمە دەوری چۆڵ دەکەین؟.

عوروە وتی: ئەوە کێیە ئەی محمد وەڵامم دەداتەوە؟.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەبو قوحافەیە؟

عوروە کاتێك قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد جاروبار دەستی دەبرد بۆ ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ،ئەمەش لە دابونەریتی عەرەبدا باوی هەبوو،بەتایبەت ئەگەر لە مەسەلەیەکی زۆر گرنگدا قسەیان بکردایە دەستیان

دەهێنا بە ڕیشی یەکتریدا، لەو کاتەشدا موغیرەی کوڕی شوعبە لە ژوور سەری پێغەمبەری خوا ﷺ وەستابوو ،هەر کاتێك عوروە دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەر ﷺ درێژ بکردایە دەیکێشا بەسەر دەستیدا و پێی دەوت:دەستت لە ڕووی پێغەمبەر ﷺ دوور بخەرەوە.

عوروە وتی: ئەی هاوار چەندە توڕە و دڵ ڕەقیت.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کارەی موغیرە دڵخۆش بوو و پێدەکەنی.

عوروە وتی: محمد ئەوە کێیە بەسەر سەرتەوە وەستاوە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ئەوە برازای خۆتە ئەوە موغیرەیە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دا بە عوروە کە نایەوێت لەگەڵ قوڕەیشدا شەڕ بکات. لەو کاتەدا عوروە لای پێغەمبەری خوادا دانیشتبوو،هاوەڵان زۆر بە ئالودەیی پەلاماری پرژەی ئاوی دەستنوێژەکەیان دەدا و تاڵی مووەکانیان دەماشییەوە و هەڵیان دەگرت،وە کاتێك کە قسەیان دەکرد دەنگیان بەرز نەدەکردەوە و بە هێمنی لەگەڵ یەکتردا دەدوان.

ئەم قەدر و ڕێزەی لە پێغەمبەریان دەگرت عوروەی سەرسام کردبوو، بۆیە لەوە زیاتر نەیتوانی دانیشێت و خێرا گەڕایەوە بۆ لای قوڕەیش و پێی وتن:ئەی خێڵی قوڕەیش بەڕاستی من لە ژیانی خۆمدا کیسرام لەسەر تەختەکەی دیوە،قەیسەریشم دیوە، نەجاشیم لەسەر تەختی پاشایەتی دیوە،سوێند بێت بە خوا، لە هەموو تەمەنمدا مەلیکم نەدیوە لە ناو گەلەکەیدا بەقەد محمد لە ناو هاوەڵانیدا خۆشەویست بێت، ئەوانەی کە لەگەڵ محمدن مل بۆ هیچ کەسێك کەچ ناکەن ، ئێوەش کەیفی خۆتانە.

## سێبەری ڕەزامەندی

پاش ئەوەی کە عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی لە دانوستانەکەیدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تەواو بوو، گەڕایەوە بۆ لای قوڕەیش،ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمانی کوڕی عەفانی نارد بۆ ئەوەی سەر لە نوێ سەبارەت بە ئاشتییەکە قسە لەگەڵ قوڕەیشدا بکات.

خێڵی قوڕەیش عوسمانی کوڕی عەفانیان خۆش دەویست ،چونکە پیاوەتی زۆری بەسەریانەوە هەبوو،عوسمان لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەککە کەوتە ڕێ ، لە نزیك دەروازەکانی شاری مەککەدا گەیشتە (سەعید ی کوڕی عاص)،سەعید پەنای گرت لە قوڕەیش هەتا بتوانێت بە کارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەستێت ،ئەوەبوو ڕاستەوخۆ چووە لای ئەبو سوفیان و گەورە پیاوانی قوڕەیش،پەیامەکەی پێغەمبەری خوای پێ گەیاندن،کە لێبوویەوە وتیان خۆت ئازادیت دەتوانیت تەوافی خۆت بکەیت.

عوسمان وتی: هەرگیز شتی وا ناکەم هەتا پێغەمبەری خوا تەواف نەکات من تەواف ناکەم .

بۆیە قوڕەیش دەستبەسەریان کرد و لای خۆیان هێشتیانەوە،لەم لاوە هەواڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە عوسمان شەهید کراوە،پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی:واز ناهێنن هەتا بەسەریاندا نەدەین.

هەموو هاوەڵانی لە ژێر یەك درەختدا کۆکردەوە و یەك لە دوای یەك بەیعەتی لێ وەرگرتن،ئەو بەیعەتە ناو نرا (بەیعەتی ریضوان)و پاشان بە درەختەکەیان دەوت (شجرة الرضوان).

(ئەبو سینانی ئەلئەسەدی)یەکەم کەس بوو بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی:پێغەمبەری خوا ﷺ دەستت بێنە با بەیعەتت بدەمێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: لەسەر چی بەیعەت دەدەیت؟

وتی: لەسەر ئەوەی کە لە دڵی تۆدایە ئەی پێغەمبەری خوا.

دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی مردنی لەگەڵ هەموو هاوەڵاندا بەست، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی موبارەکی دا بە یەکدا و و فەرمووی: ئەمە بەیعەتی عوسمانە..

بەم بۆنەیەوە ئەم چەند ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (الفتح) هاتە خوارەوە:

(لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ...)هەتا ئایەتی پیرۆزی لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا )

خێڵی قورەیش عوسمانیان هێشتەوە بۆ ماوەیەک ،پاشان سوهەیلی کوڕی عەمریان نارد تاوەکو دانوستان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بکات،پێیان وت:بڕۆ بۆ لای محمد و ئاشتی لەگەڵدا بکە و ئەو مەرجەی لەسەر دابنێ کە دەبێت ئەمساڵ بگەڕێتەوە و ساڵێکی تر بێتەوە و عومرەی خۆی بکات،چونکە سوێند بێت نابێت خێڵەکانی تری عەرەب بیکەن بە گاڵتە و بڵێن محمد بە زۆر چووە ناو مەککەوە.

سوهەیل بۆ ئەو مەبەستە بەرەو حودەیبیە کەوتە ڕێ،کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوورەوە بینی بە ئەبوبەکری فەرموو:خوا یار بێت ئیشەکەمان ئاسان بوو، قورەیش بە ناردنی ئەم پیاوە ئەیەوێت صوڵح بکات.

سوهەیل گەیشتە جێ و قسەی زۆری لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و لە کۆتاییدا صوڵح کرا.پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی داکە نوسراوێک لە نێوانیاندا بنوسن فەرمووی: ئادەی بنوسن : ئەمە ئەو سوڵحەیە کە محمد ی کوڕی عبد الله و سوهەیلی کوڕی عەمر لەسەری ڕێک کەوتن،پێک هاتین لەسەر وەستاندنی شەڕ بۆ ماوەی دە ساڵ ،بڵاو بوونەوەی هێمنایەتی لە ناوچەکەدا و نەهێشتنی تر و نائارامی و وازهێنان یەخەپێگرتنی یەکتر، وە هەر کەس لای قورەیشەوە

بێت بۆ لای محمد ﷺ بە بێ مۆڵەتی قورەیش پێویستە بگێڕدرێتەوە و هەر کەسێك لای محمدەوەوە چووە لای قورەیش نەگێڕێنەوە، ئەم صوڵحەی نێوانمان دوژمنایەتی لێ ناکەوێتەوە،نابێت لەمەو دوا دزی و خیانەت هەبێت،وە هەر کەس دەیەوێت با بڕواتە پەیمانی محمدەوە وە هەر کەس بییەوێت با بڕواتە پەیمانی قورەیشەوە ...، کاتێك پەیمان نامەکە تەواو بوو ، تەنها ئیمزا کردن و مۆری مابوو، لەملاوە عومەری کوڕی خەطاب چوو لای ئەبو بەکر و وتی:ئەی ئەبو بەکر ئایا ئەوە پێغەمبەر نییە؟

ئەبوبەکر وتی: بەڵێ

عومەر وتی: ئایا ئێمە موسڵمان نین؟

ئەبوبەکر وتی:بەڵێ

عومەر وتی:ئەی بۆچی سەرشۆڕی لە دینەکەماندا بنوێنین؟

ئەبوبەکر وتی: ئەی عومەر ،تازە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داوە و قۆڵی پێدا کردووە، منیش شایەتی بۆ دەدەم کە بڕیارەکەی ڕاستە و پێغەمبەری خوایە.

عومەر وتی: منیش بڕوام هەیە کە پێغەمبەری خوایە.

پاشان عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟

فەرمووی : بەڵێ

وتی: ئایا ئێمە موسڵمان نین؟

فەرمووی: بەڵێ

وتی: ئایا ئەوان بێباوەڕ و موشریك نین؟

فەرمووی: بەڵێ

عومەر وتی: ئیتر بۆ سەرشۆڕی لە دینەکەماندا قبوڵ بکەین؟

پێغەمبەری خوا : فەرمووی:من عەبد و پێغەمبەری خوام،هەرگیز پەیمانی خوا ناشکێنم و دڵنیام کە خوای گەورە هەرگیز بە زایەم نادات.

پاش ئەم گوتەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ عومەر کەوتە حاڵەتێکی ترس و دڵەڕاوکێوە لە ترسی ئەوەی نەبا فەرمانی خوای شکاندبێت.عومەر خۆی دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: لەو ڕۆژەوە صەدەقە دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و بە هەر چوارلادا چاکە دەکەم لە پای ئەو قسانەدا کە ئەو ڕۆژە کردم، دەترسم خواو پێغەمبەرەکەیم لێ زویر بووبێت و ئومێدم دەکرد کە عاقیبەتم خێر بێت.



کاتێکهات بۆ ئەنجامدانی دانوستانەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ،لە ئاشتی حودەیبییەدا،لە کاتی نوسینی پەیمان نامەکەدا (أبو جندل ی کوڕی سوهەیل) لەوێدا قیت بووەوە و خۆی زنجیرە بەندی ئاسن گرتبوو، خۆی لە دەست قوڕەیش ڕزگار کردبوو و هاتبووە ڕیزی موسڵمانانەوە کاتێك سوهەیل (أبو جندل)ی کوڕی بینی، بۆی هەستا و شەپازلەیەکی لێدا، یەخەی گرت و رووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی محمد ئەم کوڕەی من دوای مۆرکردنی ڕیککەوتن نامەکەدا هاتووە بۆ لاتان، لەبەر ئەوە دەبێت بمدەیتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ڕاست دەکەیت.

بۆیە سوهەیل بەرۆکی کوڕەکەی گرت و ڕای کێشا و وتی: لەگەڵم وەرە بۆ مەککە ئەگەر نا بە زۆر دەتبەمەوە.

(أبو جندل)یش هاواری دەکردە موسڵمانەکان و دەیوت: برا گەلینە فریام کەون ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ مەککە توشی فیتنە دەبم و دینەکەم دەفەوتێت.

پێغەمبەری خواش ﷺ رووی کردە (أبو جندل) و پێی فەرموو: ئەبو جندل ئارام بگرە و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکە خوای گەورە دەروویەك لە تۆ و چەوساوەکانی تریش دەکاتەوە.ئەوەش بزانە کە ئێمە پێش هاتنی تۆ وادە و

بەڵێنمان لەگەڵ ئەواندا بەستووە و بڕیارمان داوە پابەندی خاڵەکانی ناو پەیماننامەکە بین،بۆیە نابێت خیانەت بکەین.

لە پەنایەکەوە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ چووە پاڵ أبو جندل و لەگەڵیدا دەڕۆشت و پێی دەوت: ئەبو جەندەل ئارام بگرە ئەوانە موشریکن و خوێنەکەشیان پیسە. عومەر دەڵێت:دەسکی شمشێرەکەم لە ئەبو جەندەل نزیك کردبوویەوە، ئومێدم دەکرد کە دەستی بدایە و باوکی بکوشتایە، بەڵام بەزەیی پێدا هاتەوە و فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەجێهێنا.

## ئەبو بەصیر و خەباتی کەنار دەریا

پاش ئاشتی حودەیبییە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە، چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەری کابرایەکی تر موسڵمان بوو کە ناوی (عوتەیبەی کوڕی ئوسەید)وە شۆرەتەکەی (ئەبو بەصیر) بوو، ئەم پیاوە لەو کەسانە بوو کە قوڕەیش لە شاری مەککەدا دەستبەسەریان کردبوون،کاتێك قوڕەیش بەوەی زانی کە ئەبو بەصیر گەیشتۆتە مەدینە ،پیاوێکیان لە خێڵی (بەنی عامر ) بە نامەیەکەوە نارد بە شوێنیدا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لە نامەکەدا داوای گێڕانەوەی ئەبو بەصیریان کردبوو،کابرای عامر خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو کە گەیشتنە مەدینە و داخوازییەکەیان خستە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ،ئەویش رووی کردە ئەبو بەصیر و پێی فەرموو:ئەی ئەبو بەصیر خۆت دەزانی ئێمە بەڵێنمان بەوان داوە کە هەر کەس هات بۆ لای ئێمە بیگێڕینەوە بۆیان، دینەکەشمان ناهێڵێ خیانەت بکەین، بۆیە ئومێد دەکەم کە خوای گەورە دەروویەك لە تۆ و چەوساوەکانی تریش بکاتەوە،بۆیە بکەوە ڕێ و لەگەڵیاندا بگەڕێوە.

ئەبو بەصیر وتی: (یا رسول الله) ئایا دەمگێڕیتەوە بۆ لای موشریکەکان بۆ ئەوەی جارێکی تر لە دین وەرم گێڕنەوە؟پێغەمبەری ﷺفەرمووی : ئەبو بەصیر بەڕێ کەوە خوا یار بێت دەروویەکت لێ دەکرێتەوە.

ئەبو بەصیر بە ناچاری لەگەڵ دوو پیاوەکەدا ملی رێی گرت هەتا گەیشتنە ناوچەی (ذي حليفة)، ئەبو بەصیر بە کابرای عامری گوت: ئەرێ برا شمشێرەکەت تیژە یان نەء؟

وتی : بەڵێ

ئەبو بەصیر وتی: ئادەی نیشانم بدە با سەیرێکی بکەم.

کابرا وتی: قەیدی نییە... سەیری بکە.

کاتێك شمشێرەکەی وەرگرت، لە کێلان دەری هێنا و دەست بە جیٚ کابرای عامری کوشت، خزمەتکارەکەش بە ڕاکردن بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە، سەیری کرد لە ناو مزگەوتدا دانیشتووە،کاتێك لە دوورەوە بەدی کرد فەرمووی: ئەم پیاوە لە دەموچاویدا دیارە کارەساتێکی بەسەر هاتووە.

کاتێك نزیك بووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیٚی فەرموو:چیت لێقەوماوە؟

کابرا وتی: هاوەڵەکەی ئێوە هاوەڵەکەی منی کوشت.

کەمێکی پێچو ئەبو بەصیر شمشێرەکەی کابرای عامری بەدەستەوە بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺوتی:ئەیپێغەمبەری خوا ﷺتۆ بەرامبەر پەیمانەکەی خۆت وەفادار بوویت،خوای گەورە بۆی دایتەوە،ئەوە بوو جەنابت بە پیٚی پەیمانەکە منت بەوان تەسلیم کردەوە،منیش لە ڕێگا بڕیارم دا نەڕۆمەوە نەبا دینەکەم بفەوتێت و گاڵتەم پیٚ بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئای ئەم پیاوە چەند کابرایەکی ئازا و جەنگاوەرە، خۆزگە کۆمەڵێك پیاوی تری لەگەڵ دەبوو.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا کە ئەبو بەصیرشاری مەدینە بەجیٚ بهێڵیٚ و تیایدا دانەنیشێت، بۆ ئەوەی پەیمان نامەکەی نێوان پێغەمبەر و قوڕەیش زیانی پیٚ نەگات.

ئەبو بەصیر لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەدینەی بەجێهێشت و رووی کردە ناوچەی (عیص) کە دەکەوێتە نزیك کەناری دەریاوە.

لەولاشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموو‌بووی:(ئەی ئەم پیاوە چەند کابرایەکی جەنگاوەرە . خۆزگە کۆمەڵیٚ پیاوی تریشی لەگەڵدا دەبوو)، کەوتە بەر گوێی ئەو پیاوانەی کە لە مەککەدا دەستبەسەر کرابوون ،هەموویان پۆل پۆل مەککەیان بەجیٚ هێشت و روویان کردە ناوچەی (عیص) بۆ لای ئەبو بەصیر،ئەوەندە زۆر بوون ژمارەیان گەیشتە ٧٠ پیاو (ئەبو جەندەللی کوڕی سوهەیلیش) یەکێك بوو لەوانە.

ئەم کۆمەڵە جەنگاوەرە لە ناوچەی (عیص)دا قورەیشیان تەنگەتاوو کردبوو،هەر کەسێکی قوڕیشی موشریکیان بگرتایە دەیان کوشت، هەر کاروانێك بەو ناوچەیەدا تێپەڕ بووایە تالانیان دەکرد، قوڕەیش بەم حاڵە زۆر پەرێشان بوون، نامەیەکیان نوسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو تکایان لێ کرد ئەگەر دەتوانێت ئەوانە بگرێتە خۆی و بگەڕێنەوە شاری مەدینە، بۆیە قوڕەیش بە دەستی خۆی ئەو بەندەی پەیماننامەکەی سڕییەوە کە پەیوەست بوو بە گێڕانەوەی نۆ موسڵمانەکان بۆ شاری مەککە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی نارد بۆ ئەبو بەصیر و تاقمەکەی و داوای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، ئەوانیش بەم هەواڵە گەشانەوە، بە دەنگی سرودی بەرزێتی ئیسلامەوەبە کۆمەڵ گەڕانەوە شارە سەربەرزەکەی مەدینە.

دیداری بیستە و دوو

## شوانێکی ڕەش پێست

لەو کاتەدا کە تازە گەمارۆی شاری خەیبەر درابوو، شوانێکی ڕەش پێست ناوی (یسار) بوو، بە کرێ شوانیی بۆ کابرایەکی جولەکە دەکرد، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا داوات لێ دەکەم باسی ئاینی ئیسلامم بۆ بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ باسێکی تێر و تەسەلی ئاینی ئیسلامی بۆ کرد، کابرا موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کات بە چاوی کەمەوە سەیری هیچ مرۆڤێکی نەکردووە و، کاری کەسی بە کەم نەزانیوە. بۆیە زۆر بە پەرۆشەوە ئاینی ئیسلامی بۆ باس کرد و، گرنگی پێدا، کابرای ڕەش پێست باوەڕی بە خۆی نەدەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بیدوێنێت، بۆیە ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت:ئەی پێغەمبەری خوا من کابرایەکی ناشرینم، هیچ ماڵ و سامانیشم نییە، ئەگەر ئێستا لەگەڵ ئەو دوژمنانەی خوادا بجەنگێم و بکوژرێم، ئایا دەڕۆمە بەهەشتەوە؟

فەرمووی: بەڵێ.

شوانەکە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من بە کرێ شوانیم دەکرد بۆ خاوەنی ئەم مەڕانە، ئێستا ئەم ماڵە ئەمانەتە، چی لێ بکەم و چۆن بیگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکەی؟

فەرمووی: دەستیان لێ هەڵتەکێنە خۆیان دەگەڕێنەوە لای خاوەنەکانیان.

کابرای مشتی وردە بەردی هەڵگرت و وەشاندی بە ناویاندا و بە دەم خۆیەوە دەیگوت: بگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنەکانتان، سوێند بێت ئیتر هاوڕێیەتیتان ناکەم.

دەست بەجێ مێگەلەکە هەروەکو یەکێك بەدوایاندا بێت ملی ڕێیان گرت و خۆیان کرد بە قەلاَکەدا.

یساری شوانکارە، خۆیشی چووە ریزی موسڵمانان و  و بەرەو رووی قەلاَی فێڵ و ستەم کەوتنە ڕێ بۆ جەنگ،لە کاتی شەڕەکەدا بەردێك بەر سەری کەوت و شەهید بوو لە کاتێکدا تەنها یەك نوێژی نەکردبوو.

تەرمەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە پشتەوە دایاننا، پێغەمبەری خوا ﷺ لایەکی بۆ کردەوە و زەردخەنەیەکی کرد و ئەم دوعایەی فەرمووی: خوای گەورە دەم و چاوی درەشاوە بکە، بۆنی خۆش بکە و ماڵ و سامانی لە بەهەشتدا بۆ زیاد بکەیت .

دیداری بیست و سیٚ

## کۆچەرییە شەهیدەکە

شەدادی کوڕی هاد دەگێڕێتەوە: جارێکیان کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەڕی هێنا و پیٚی وت:لەگەڵتدا کۆچ دەکەم،پێغەمبەری خوا ﷺ دایە دەست یەکێك لە هاوەڵان و پیٚی فەرموو کە ئاگای لێبێت.

کاتێك جەنگی خەیبەر هاتە پێشەوە موسوڵمانان لەوٚ جەنگەدا هەر لە سەرەتاوە هەندیٚ دەستکەوتیان دەست کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ کابرای دەشتەکی بانگ کرد و بڕێك لەو دەستکەوتەی دایە، چونکە خەریکی چاودێری کردنی وشتری موسڵمانان بوو، کاتێك بەشەکەی خۆیانیان دایە وتی: ئەمە چییە؟

وتیان: ئەوە بەشەکەی خۆتە.

کابرای دەشتەکی بەشەکەی هەڵگرت و هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و سلاٚوی لیٚ کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بۆ ئەمە شوێنی تۆ نەکەوتووم، بەڵکو بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم کە تیرێك بدات لە گەردنم و شەهید ببم و بچمە بەهەشتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاست بکەیت خواش ئاواتەکەت بۆ دەهێنێتە دی.

پاشان شەیپوری شەڕ لێدرا، جەنگ دەستی پیٚ کردەوە، پاش کەمێك تەرمەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، تیرێك دابووی لە گەردنی بەو شێوەیەی خۆی وەصفی کردبوو.

**پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: خۆیەتی؟**

**وتیان: بەڵێ.**

**فەرمووی: بە ڕاستی لەگەڵ خوادا ڕاستی کرد خواش ئاواتەکەی هێنایە دی.**

**پێغەمبەری خوا ﷺ جبەکەی خۆی لێ ئالاند و لەبەردەمی خۆیدا داینا و نوێژی لەسەر کرد، پاشان فەرمووی:** (اللهم هذا عبدك، خرج مهاجراً في سبيلك، قتل شهيداً، و أنا عليه شهيد)، **واتە: (خوایە... ئەمە بەندەی تۆیە، لە پێناوی ڕێبازی تۆدا کۆچی کرد،ئێستا شەهید بووە، منیش شایەتی بۆ دەدەم)**

## خەڵکی ناو کەشتییەکە

پاش ئەوەی جەنگی خەیبەر بە سەرکەوتنی موسڵمانەکان کۆتایی هات، دوا بەدوای ئەم رووداوە گرنگە، ، کۆچکەرانی حەبەشە،لە دوورە وڵاتییەوە گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، سەرکردەکەیان جەعفەری کوڕی ئەبو طالب بوو ،لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە دڵ خۆش بوو دەیفەرموو: نازانم بە کامیان زیاتر دڵخۆش بم فەتحی قەڵاکانی خەیبەر؟، یان گەڕانەوەی جەعفەری کوڕی ئەبو طالب؟.

رۆژێکیان (ئەسمائی کچی عەمیس)خێزانی جەعفەر سەردانی (حەفصەی کچی عومەر)ی کرد، لەوێ دانیشتبوو،کاتێك عومەر هاتەوە، ئەسمائی نەناسییەوە، وتی: حەفصە ئەم ئافرەتە کێیە لەگەڵت دانیشتووە؟

حەفصە وتی: ئەمە (ئەسمائی کچی عەمیس)ە!

عومەر وتی: کچە حەبەشییەکە، ئەوەی بە کەشتی کۆچی کرد؟

ئەسماء وتی بەڵێ

عومەر وتی: ئەی ئەسماء ئێمە پێشی ئێوە کەوتین لە کۆچکردندا، بۆیە ئێمە شیاوترین بە نزیکی لە پێغەمبەری خوا لە ئێوە!

ئەسماء وتی: نەخێر سوێند بە خوا وەها نییە، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوون برسیتانی تێر کردووە و، ئامۆژگاری نەزانەکانتانی کردووە، بەڵام ئێمە لە وڵاتی غەریبایەتی و ڕق و کینەدا بووین، ئەویش لە پێناوی ڕێبازی خوا و پێغەمبەرەکەیدا بووە،وە سوێند بێت نان و ئاو ناخۆم هەتا نەچمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەمەی بۆ نەگێڕمەوە، نابێ زیاد و کەمی تێدا بکەم.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ماڵەکەی حەفصە کە ئەو کاتە خێزانی بوو، ئەسماء وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عومەر ئاوا و ئاوای وتووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی تۆ چیت پێ گوت؟

ئەسماء وتی: منیش ئاوا و ئاوام پیٚ گوت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ئەوان شیاوتر نین لە ئێوە لە نزیکیتان لە منەوە، ئەو خۆی و هاوەڵانی یەك جار کۆچیان کردووە ، بەڵام ئێوە و خەڵکی ناو کەشتییەکە دوو جار کۆچتان کردووە.

ئەسماء دەڵیٚ:ئەبو موسای ئەشعەری و کۆچەریانی ناو کەشتییەکە هەر جارەی یەکێکیان سەردانیان دەکردم و هەواڵی ئەم فەرموودەیان لیٚ دەپرسیم، لە دنیادا هیچ شتێکیان لە دڵدا هێندەی ئەم هەواڵەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرموو بووی لە لای خۆشەویستر نەبوو.

## دیداری بیست و پێنج

# قەزا کردنەوەی عومرە

لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ رووی کردە مەککە بۆ قەزا کردنەوەی عومرەکەی ساڵی ڕابردوویان.

ئەو موسڵمانانەی کە قورەیش ساڵی ڕابردوو نەیهێشت بڕۆنە ناو مەککەوە، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕێ کەوتن.

ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی ڕابردوودا پەیمان نامەیەکی لەگەڵ قورەیشدا مۆر کرد،کە بۆ ساڵی داهاتوو بگەڕێنەوە بۆ عومرە،بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا تەنها ئەو کەسانە لەگەڵیدا بەڕێ بکەون کە ساڵی پار پەیمانی ئاشتەوایی حودەیبیەیانبینیوە.

لە لایەکی ترەوە قورەیش پڕوپاگەندەی بڵاو کردبوویەوە کە گوایە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان توشی ئازار و ماندوبونێکی زۆر هاتوون و لاواز بوون و ناتوانن بگەڕێنەوە.

بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەککە،هاوەڵان بە دەوریدا خڕ بوونەوە و بە گیان و ماڵ پارێزگارییان لێدەکرد و،گرجوگۆڵ و چالاکییەکی زۆریان پێوە دیار بوو،لە هەموو لایەکەوە دەیان پاراست،نەبا کەسێك لە دەرەوە بیبەوێت ئازاری بدات.

پێغەمبەر ﷺ سواری وشترەکەی بووبوو، (عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) جڵەوەکەی گرتبوو،شیعری بەسەر پێغەمبەری خوادا دەوت ﷺ ،کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناو حەرەمی کابەی پیرۆز،خەڵکی شاری مەککە لە بەردەم (دار الندوە) دا ڕیز بوون و سەیری پێغەمبەری خوایان دەکرد ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ رووی کردە هاوەڵان و فەرمووی: ڕەحمەت لەو کەسەی کە ئەمڕۆ هێز و بازووی خۆی نیشانی بێباوەڕان دەدات.پاشان چووە گۆشەی (رکن).دەستی کرد بە ڕاکردن و بەجێهێنانی (مناسك)ی عومرە،

سیٚ جار ڕایکرد و هاوەڵانیش بە دوایدا ڕایان کرد. پاشان هاوەڵان چوون و هەندێك ئاوی زەمزەمیان هێنا،پێغەمبەر ﷺ لێی خواردەوە و دەستنوێژی پێ شت،هاوەڵان شەڕیان بوو لەسەر ئەو دڵۆپە ئاوانەی کە لە دەم و چاوی پیرۆزی پێغەمبەری خواوەﷺ دەگەوتە خوارەوە و،نەیانهێشت بکەونە سەر زەوی،ئەم دیمەنانە خەڵکی ناو مەککەی هەژاند و سەریان دەسووڕما لەو شێوە ڕێزگرتنەی هاوەڵان کە لە پێغەمبەرەکەیانی دەگرن.

## دیداری بیست و شەش

# شەهیدەکانی جەنگی (مؤتة)

لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا،پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی نارد بۆ ناوچەی (مؤتە)و (زەیدی کوڕی حاڕثە)ی کردە سەرۆکیان.

پێش خوا حافیزی لێکردن فەرمووی: ئەگەر (زەید) شەهید بوو (جەعفەری کوڕی ئەبو طالب) بکەنە سەرۆکی خۆتان، ئەگەر ئەویش شەهید بوو (عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) بکەنە میری خۆتان.

خەڵك خۆیان بە تەواوی سازدا و،نزیکەی سێ هەزار کەس کەوتنە ڕێ،کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ خوا حافیزی لێ کردن، (عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) دەستی کرد بە گریان.

وتیان: بۆچی دەگری؟

وتی: سوێند بێت بە خوا نە بۆ دنیا دەگریم و، نەخەمی جیابونەوەمە، بەڵام جارێکیان گوێم لێبوو پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوەوە: ﴿وإن منكم إلا واردها كان على ربك حتما مقضيا ﴾ -مريم-، نازانم چۆن زاتی (ورود) بکەم لە ناو دۆزەخدا!

پاشان موسڵمانان هەموو خواحافیزییان کرد لە سوپاکە و دوعای خێریان بۆ کردن.

(عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی خوا حافیزی لێ بکا،بۆ دواجار تێر سەیری دەم و چاوی پیرۆزی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ، هەر وەك ئەوەی بە دڵ هەواڵی زانیبێ کە ناگەڕێتەوە،خوا حافیزی لە پێغەمبەری خوا کرد کەوتە ڕێ.

هەتا گەیشتە وڵاتی شام هەواڵی پێ گەیشت کە(هەرقلی) سەرکردەی ڕۆمەکان بە خۆی و سەد هەزار سوارەوە گەیشتۆتە (مآب) لە ناوچەی (بلقاء) و و سەد هەزار کەسی تریش لە خێڵە عەرەبەکانی ناوچەکە پەیوەندییان پێوە کردووە.

موسڵمانەکان کە ژمارەیان تەنها سێ هەزار کەس دەبو،دوو شەو لە ناوچەی (معان) مانەوە وقسە و ڕاوێژی تەواویان کردلە بارەی ڕۆمەکانەوە،هەندێکیان وتیان: با نوسراوێك بنوسین بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لە بارەی ژمارەی خۆمان و ئەوانیشەوە هەواڵی تەواوی بدەنێ. ئەویش یان پیاوی ترمان بۆ دەنێرێت یان فەرمانێکی ترمان پێ دەکات و ئێمەش بەگوێی دەکەین.

(عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) هاتە پێشەوە و بە گەرمی هانی موسڵمانەکانی دا لەسەر جیهاد و فەرمووی: موسڵمانینە.. ئێوە تامەزرۆی شەهیدین، کەی ژمارە و چەك هیچ کاتێك ئێوەی ترساندوە؟ ، ئێمە بەم دینە شەڕیان لەگەڵدا دەکەین کە خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێزداری کردووین، هەستن و هەڵمەت بەرن، یان سەردەکەوین یان شەهادەت حاصل دەکەین، (إحدى الحسنيين) چاوەڕوانمانە.

ئەم قسانەی عەبدوڵا هەموویانی گەرم کرد و بڕیاریاندا شەڕ بکەن، وەك شێر هەڵمەتیان بردە سەر سوپای ڕۆمەکان لە گوندی (مشارف) و شپرزەیان کردن،پاشان دوژمن سوپاکەی کۆکردەوە و موسڵمانەکان کەمێك کشانەوە بۆ گوندی (مۆتە) و ئەم جارەیان باشتر ڕیزەکانیان ڕێکخستەوە، شەڕ گەرم بوو، زەیدی کوری حارثە ئاڵاکەی پێغەمبەری خوای بەدەستەوە بوو ﷺ، هەتا شەهید کرا، ئینجا جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و شەڕی کرد، ئەسپەکەی پەکی کەوت و دابەزی،بە ڕۆشتنەوە شەڕی دەکرد هەتا دەستی ڕاستی بڕاو لێ بۆوە، پاشان بە دەستی چەپی ئاڵاکەی هەڵگرت، ئەویشیان بڕی.. تا دەستەکەی تریشیان بڕی هەر هۆنراوەی دەوت و هانی موسڵمانانی دەدا هەتا کەوت و شەهید بوو،هەتا (عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە) ئاڵاکەی هەڵگرت و لە سوار ئەسپەکەی دابەزی و بە پێ بە ناو سوپاکەدا دەهات و دەچوو، هاواری دەکرد و هەتا سەر لە ئێوارە شەڕی کرد، زۆر ماندوو بوو،لەرۆژئاوادا ئامۆزایەکی پارچە ئێسقانێکی هێنا هەندێ گۆشتی پێوە بوو وتی:ئەم گۆشتە بخۆ با هەندێك بێیتەوە سەر خۆت، (عەبدوڵا) پارچە ئێسقانەکەی هەڵگرت و مژی،

که گوێی له دەنگ و سەدای جیهاد بوو، جارێکی تر هەستایەوە و ئێسقانەکەی فڕێدا و خۆی هاویشتە ناو گەرمەی شەڕەکەوە، هەتا خەڵتانی خوێن بوو و شەهید کرا.

دوای شەهید بوونی عەبدوڵا موسڵمانەکان شپرزە بوون،پیاوێك بە ناوی (ثابتی کوڕی ئەقرەم)ئاڵاکەی هەڵگرت و هاواری کرد : موسڵمانینە... خێرا یەکێك هەڵبژێرن بۆ سەرۆکی خۆتان، با موسڵمانان لە دەوری خڕ ببنەوە.

موسڵمانەکان وتیان: خۆت دەست بە کار بە، خۆی قبوڵی نەکرد لەوێدا چاوی بە خالیدی کوڕی وەلید کەوت،خێرا هاواری لێ کرد و ئاڵاکەی دایە دەستی، خالید وتی: ثابت تۆ لە من شیاوتری.

ئەویش وتی: نەخێر تۆ لە من لەپێشتری و باشتر لە هونەری جەنگ دەزانیت.

خالید ئاڵاکەی هەڵگرت و بەرگریەکی زۆر باشی لە سوپاکە کرد، پاشان بە شێوەیەکی گونجاو پاشەکشەیەکی مەحکەمی بە سوپاکە کرد و لەو دوژمنە سەر سەختە ڕزگاری کردن.

لە ڕۆژی جەنگ و هەرا سەختەکەدا، کە ئەو سێ سەرکردە مەزنە شەهید کران، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی چووە سەر مینبەر، یەك یەك باسی شەهیدەکانی بۆ هاوەڵان کرد و لە دەنگ و باسی جەنگەکە ئاگاداری کردن.موسڵمانەکان دەست لە دڵ چاوەڕوانی دوا ئەنجامەکانی ئەو شەڕە بوون...

ئەسمائی کچی عەمیس دەگێڕێتەوە:

لەو ڕۆژەدا کە جەعفەر و هاوەڵەکانی شەهید کران من هەویرم دەشێلا و،منداڵەکانم شۆردبوو و پاکم کردبوونەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەماڵەوە و فەرمووی: هەستە منداڵەکانی جەعفەرم بۆ بهێنە.

مناڵەکانم هێنایە بەردەستی ، یەك یەك ماچی کردن و بۆنی پێوە کردن و چاوەکانی بە دڵۆپی فرمێسك سوور بوون.

وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دایك و باوکم بە قوربانت بێت چی رووی داوە؟ ئایا لە بارەیانەوە هیچت پێ گەیشتووە؟

فەرمووی: بەڵێ.. جەعفەر و هاوەڵەکانی شەهید کراون.

ئەسماء دەڵێ: دەستم کرد بە شین و گریان، ژنانم لێ کۆ بۆبۆوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی کردکە هاوەڵان یارمەتی ماڵی جەعفەر بدەن و نانیان بۆ دروست بکەن.

لەولاشەوە لە مەیدانی جەنگدا خالید سوپاکەی پاشەکشە پێ کرد و، بەرەو مەدینە گەڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە دەرەوەی شار بۆ پێشوازیان سواری وشترەکەی بوو بوو،ژمارەیەکی زۆریش لە خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا هاتبوونە دەرەوەی شار،بەڵام کەوتنە خۆڵباران کردنی سوپاکە و، پێیان دەوتن: ئێوە لە شەڕی دژی کافران ڕاتان کردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکەکەی بێدەنگ کرد و فەرمووی: نەخێر ئەمانە لە جەنگ ڕایان نەکردووە، بەڵکو پاشەکشەیان کردووە و خوا یار بێت جارێکی تر دەگەڕێنەوە.

## هەڵەیەکی گەورە و لێبوردنێکی گەورەتر

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا فەتحی مەککە بکات،خۆی ئامادە کرد و هاوەڵانیشی لەگەڵدا کەوتنە ڕێ . بڕیاری لەسەر ئەوە بوو کە هیچ خوێنێك نەڕێژێت و لەبەر خۆیەوە ئەم نزایەی دەخوێند: (اللهم خذ العیون عن قریش حتی نبتغها في دیارها..)واتە: (خوایە چاوی قوڕەیش لە ئاستی ئێمەدا کوێر بکەیت، هەتا بە ناکاو دەدەین بە سەریاندا).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو سەفەرەیدا نەیدەویس هیچ کەسێك بزانێت بەرەو چ ئاراستەیەك دەڕوات، بەڵام یەکێك لە هاوەڵان بە ناوی (حاطەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە) کە بەشداری لە جەنگی بەدردا کردبوو، بە بۆچوونی خۆی وای دەزانی سوپای موسڵمانان بەرەو مەککە دەچێت،بۆیە بە پەلە نامەیەکی بۆ خێزانەکەی نووسی داوای لێ کردبوو کە بە زووترین کات شاری مەککە بەجێ بهێڵن،نامەکەی دایە دەست ژنێك لە خێڵی (مزینە) و لە بەرامبەری ئەوەشدا کرێیەکی دایە بە مەرجێ بیگەیەنێتە دەست خێزانی یان کەسێك لە بنەماڵەکەی.

ژنەکە نامەکەی خستە نێو پرچییەوە و کەوتە ڕێ، خوای گەورە لە ڕێگەی وەحییەوە پێغەمبەری لەو کارە ئاگادار کردەوە، دەست بەجێ (عەلی) و (زوبێر)ی نارد بە شوێن ژنەکەدا و پێی فەرموون: بەرەو مەککە بکەونە ڕێ، هەتا دەگەنە ژنێك کە نامەیەکی حاطەب ی پێیە، خەڵکی مەککە ئاگادار دەکاتەوە لە ئاڕاستەی سەفەرکەمان،.

هەردووکیان کەوتنە ڕێ لە ڕێگە گەیشتن بە ژنەکە، داوایان لێ کرد کە لەسەر وڵاخەکەی دابەزێت، دابەزی و ئەوانیش لەناو بارەکەدا زۆر گەڕان بۆ نامەکە نەیان دۆزییەوە، دوایی داوایان لێ کرد کە نامەکەیان بداتێ،

لەسەرەتادا نکوڵی لێکرد، بەڵام هەڕەشەی ئەوەیان لێ کرد ئەگەر نەیانداتێ ئەوا بە زۆر لێی دەسێنن، ئەویش نامەکەی دەرهێنا و دایە دەستیان.

(عەلی)و(زوبێر) نامەکەیان وەرگرت و چوونەوە بۆ مەدینە ونامەکەیان دایە دەست پێغەمبەری خوا ﷺئەویش حاطەب ی بانگ کرد و پێی فەرموو: حاطەب چی وای لێ کردیت ئەم کارە بکەیت؟

حاطەب کە زانی کارەکەی ئاشکرا بووە و خوای گەورە مەسەلەکەی بە تەواوی لە پێغەمبەری خوا گەیاندووە،بۆیە نکوڵی بۆ نەکرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ... سوێند بێت من مرۆڤێکم ئیمانم بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، نە باوەڕم گۆڕیوە نە دڵڕاوکێمان بۆ دروست بووە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە من پیاوێکی بێ کەسم،لە شاری مەککەدا کەسوکار و پشتیوان و عەشیرەتم نییە،لە کاتێکدا ژن و منداڵەکەم لەوێن و کەس نییە پارێزگارییان لێ بکات،بۆیە لەوە دەترسم شتێکیان لێ بێت و،هەواڵەکەشم بۆ ئەوان ناردبوو، هەتا لە شار بڕۆنە دەرەوە،بۆ ئەوەی توشی زیان نەبن.

عومەرێ کوڕی خەطاب ﷺ لەوێدا وەستابوو، گوێی لەم قسە و باسانە بوو، داوای کرد کە بدەن لە سەری حاطەب و بیکوژن، چونکە هەڵگەڕاوەتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺرووی کردە عومەر و پێی فەرموو: ئەی عومەر تۆ چوزانیت کێ دەڵێت خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی بەشدار بووانی جەنگی بەدر خۆش نەبووە!، بە تایبەتی کە پێی فەرموون:(إعملوا ما شئتم قد غفرت لكم)،هەر چییەك دەکەن بیکەن لە هەموو گوناهەکانتان خۆش بووم.

ئەو هەڵوێستە مەزنەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ئەو خیانەتە گەورەیەدا کە (حاطەب) کردبووی، مەگەر تەنها قەڵەمێکی لێخۆش بوونی وەك (بەدر) بتوانێ بیسڕێتەوە،وە گەر نا خیانەتی گەورە لە کاتی جەنگدا لە هەموو دنیادا بریتییە لە کوشتن، بەڵام ئەوانەی لە جەنگی بەدردا بەشدارییان کردووە لەو موسڵمانە ساغ و دڵ گەورانە بوو کە توانییان لە دیمەنێکی بێ وێنەدا هەموو

حیساباتی سەربازی موشریکان بە درۆ بخەنەوە و گەورەترین سەرکەوتنی سەربازی بۆ دینی خوا تۆمار بکەن. ئەوانەی لەو شەڕەدا بەشدار بوون،بە شایەتی خوای مەزن، گەورەترین سەربازی گیانفدای ئیسلام بوون.

بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕابردووی حاطەبی هێنایە پێش چاو، ئەوەی بە لاوە مەزنتر بوو لە هەڵەکەی، لەبەر ئەوە لێی خۆش بوو... چونکە دڵنیا بوو کە حاطەب لەسەر ڕاست گۆیی و دڵسۆزییەکەی خۆی ماوەتەوە.

# جێگاکەی پێغەمبەری خوا

بە پێی پەیمانی حودەبییە، خێڵی خوزاعەش پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستبوو، بەو پێیە لە پەیمانی ئاشتییەکەدا لە ڕیزی موسڵماناندا بوون.

خێڵی (بەنوبەکر)یش چوونە پەیمانی قوڕەیشەوە و لە پەنای ئەواندا بوون. پاش نوسینی عەقدی صوڵحەکە خێڵی بەنو بەکر بە شەو هەڵیان کوتایە سەر خێڵی خوزاعە و بەندی پەیمان نامەکەی حودەیبیەیان شکاند، لەو هەڵکوتانەدا قوڕەیش یارمەتی خێڵی (بەنو بەکر)یان دابوو،لە ئەنجامدا چەند پیاوێکی خێڵی خوزاعەیان کوشت، بەم کارە قوڕەیش بە دەستی خۆی بەندەکانی ئاشتی حودەیبییەیان پێشێل کرد،خێڵی خوزاعەش هاواریان بردە لای پێغەمبەری خوا و داوایان لیّ کرد کە پشتیوانییان لیّ بکات.پێغەمبەری خواش ﷺ بڕیاری دا کە پشتیوانییان لیّ بکات و بە تەواوی فەتحی مەککە بکات،چونکە قوڕەیش پەیمان شکێنییان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ دە هەزار موسڵمانی شەڕی کۆکردەوە و،خۆیان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی بەرەو مەککە بکەونە ڕیّ، هێشتا وەفدی خێڵی خوزاعە نەگەڕابوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پیّی فەرموون: لەوانەیە لە ڕێگادا ئەبو سوفیانتان پیّ بگات و بییەوێت جارێکی تر پەیمانەکە ببەستێتەوە و ماوەکە درێژتر بکاتەوە.ئێوە گویّ مەدەنیّ، هەر واش بوو، لە ڕێگادا خێڵی خوزاعە ئەبو سوفیانیان بینی بە سواری وشترەکەیەوە بە پڕتاو بەرەو مەدینە دەڕۆشت.

کاتێك کە گەیشتە مەدینە لەماڵی (رملە) یان (أم حبیبە)ی کچی دابەزی کە خێزانی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ،کاتێك کە ویستی لەسەر فەرشەکەی

پێغەمبەری خوا دابنیشێت، (أم حبیبە)فەرشەکەی لەژێر باوکیدا ڕاکێشا و نەیهێشت لەسەری دابنیشێت.

ئەبو سوفیان وتی: کچم ئەوە چییە!،بۆچی فەرشەکەم لە ژێردا ڕادەکێشیت، من بە حەیف دەزانی یان فەرشەکە؟

(أم حبیبە)ی کچی وتی: وەڵا فەرشەکە بە حەیف دەزانم چونکە ئەوە فەرشی پێغەمبەری خوایە ﷺ و ئەو لەسەری دادەنیشێت،تۆ موشریکیت، حەز ناکەم لەسەر فەرشی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دابنیشیت.

ئەبو سوفیان لەم هەڵوێستەی کچەکەی زۆر سەرسام بوو، پاشان چووە دەرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی سەبارەت بە درێژکردنەوەی پەیماننامەکە قسەی لەگەڵدا بکات. پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە،ئەبو سوفیان هەستا و چووە لای ئەبو بەکر،ئەویش وەڵامی نەدایەوە،ئەبو سوفیان داوای لە ئەبو بەکر کرد کە قسەیەك لەگەڵ پێغەمبەردا بکات، وتی: ئەگەر خۆی ڕەتی کردبێتەوە هەرگیز داوای لێ ناکەم کە وەڵامت بداتەوە. پاشان ئەبو سوفیان رووی کردە عومەر،سا بەڵکو ئەو دڵی نەرم بێت و بیباتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺعومەر رووی کردە ئەبو سوفیان و بە سەرسامییەوە وتی: من بڕۆم لەبەر تۆ داوا لە پێغەمبەری خوا بکەم؟!!، هەرگیز شتی وا نابێت.

بە دڵ شکاوییەوە رووی کردە (عەلی کوڕی ئەبو طالیب) و پێی وت:تکات لێ دەکەم تۆ لە هەموویان زیاتر بەڕەحمتری لەگەڵمدا خزمایەتیمان لە هەموویان بەهێز ترە،بۆیە داوات لێ دەکەم بە نائومێدییەوە دەستت بە روومەوە مەنێ،لای پێغەمبەری خوا تکایەکم بۆ بکە.

عەلی وتی:ئەی ئەبو سوفیان کاتێك پێغەمبەری خواﷺ بڕیار بدات لەسەر هەر شتێك کەس ناتوانێت قسەی تێدا بکات، بۆیە چۆن هاتوویت هەر وایش بگەڕێرەوە.

ئەبو سوفیان سەری شۆڕ کرد و بە نائومێدی بەرەو شاری مەککە گەڕایەوە.

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خۆی و سوپاکەیەوە فەتحی مەککەی کرد و، بە دەوری کابەدا تەوافی کرد فەرمانی دا ئاوی زەمزەمیان بۆ هێنا و دەستنوێژی شت، هاوەڵان دڵۆپە ئاوەکانیان کۆ دەکردەوە و بۆ پیرۆزی بەکاریان دەهێنا ﷺ، خەڵکی شاری مەککە لە بینینی ئەم دیمەنە زۆر سەرسام بوون، لەبەر خۆیانەوە دەیان وت بە ڕاستی گەورە ئەمەیە، شوێنکەوتنی ڕاستەقینە هەر وا دەبێت....

# ئافرەتێکی جەنگاوەر

پاش ڕزگار کردنی شاری مەککە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە دەرەوەی شار و، لە شەڕی (حنين)دا لەگەڵ موشریکاندا دەستە و یەخە بووەوە، لەو شەڕەدا کە یەکەم جار موشریکان دەستیان وەشاند لە موسڵمانان، بە زۆرینەی هاوەڵان شپرزە بوون و ڕایان کرد. (ئەبو طەلحە) زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری یەکێك بوون لەوانەی ڕایان نەکرد و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا مانەوە، بە دەستی خۆی زیاتر لە بیست موشریکی لەو شەڕەدا کوشت و بریندار کرد، ئەو ئازایەتییەی (ئەبو طەلحە) سەرنجی پێغەمبەری خوای ﷺ ڕاکێشا، فەرمووی: بە ڕاستی (ئەبو طەلحە) شێرێکە لە شێرەکانی خوا، لە لایەکی ترەوە (أم سليم)ی خێزانیشی کە ئەو دوو گیان بوو بە (عەبدوڵا)ی کوڕی(ئەبو طەلحە)وە، پەڕۆیەکی لە ناوقەدی شەتەك دابوو،بە دەستێکەوە جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەری خوای گرتبوو، بە دەستێکی تریش خەنجەرێکی هەڵگرتبوو.

کاتێك (ئەبو طەلحە) بەم شێوەیە (أم سليم)ی بینی، وتی: ئەوە چی دەکەیت (أم سليم)؟

أم سليم وتی:لێرەدا وەستاوم بۆ ئەوەی ئەگەر هەر موشرکێك لە پێغەمبەری خوا نزیك بێتەوە، بەم خەنجەرەی دەستم ورگی هەڵدەدڕم.

(ئەبو طەلحە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕێزتان لە بارەی (أم سليم) وە چی دەڵێن؟....

پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەو دیمەنەی بینی دەستی کرد بە پێکەنین و بەگەرمی دوعای خێری بۆ کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەزانیّ کە ئەگەر هات و موشریکان شاڵاویان بۆ هێنا (أم سليم) ناتوانێت بەرگری لە پێغەمبەری خوا بکات و شەهید دەکریّ،

بەڵام لەم دیمەنە و هەموو هەڵوێستەکانی تریشدا کەی سەرکەوتن و زیرکەوتن پێوەر بووە؟، بەڵکو نیازی دڵ و ڕاستگۆیی لەگەڵ خوا و لێبڕان پێوەری دیاری کردنی مرۆڤە گەورەکان بووە. بۆیە لێرەدا لەگەڵ ئەو حاڵەتە تایبەتییەدا، دەبو أم سلیم لە ماڵەوە دانیشتایە و بحەوایەتەوە و دەرفەتی شەرعیشی هەبوو؛ بەڵام خواست و ئیرادەی ئەو ئافرەتە خەباتگێڕە لە هەموو ئەوانە گەورەترە، بۆیە دەبێتە جێگەی ڕەزامەندی خوا و نزا و دوعای خێری پێغەمبەرەکەی ﷺ.

دیداری سێیەم

## ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی شاری (طائف)ی کرد، وشترەکەی بەرەو ناوچەی جەعرانە گەڕایەوە، (ئەبو هەرەمی غەفاری) شان بە شانی وشترەکەی پێغەمبەر،ئەویش بە سوار وشترەوە دەڕۆشت، بە شێوەیەك ئازاری قاچی پێغەمبەری داو ئێشی گەیاندێ. پێغەمبەری خوا ﷺ رووی کردە کابرا و گوتی: ئەرێ کابرا بە تەواوی ئازارت پێ گەیاندم بۆیە بە کلکی قامچییەکەی دەستی لە کابرا چەنی و دووری خستەوە.

ئەبو رەهەمی غەفاری دەڵێ: ئەوەی کە رووی دا لە نێوان من و پێغەمبەردا ﷺ پەرێشانی کردم، جێگەم بە خۆم نەدەگرت،دەترسام قورئان لە بارەی منەوە بێتە خوارەوە،چونکە ئازاری پێغەمبەری خوام دابوو،بۆ رۆژی دوایی لە جەعرانە وشترەکانم بردە دەشت ودەر بۆ لەوەڕاندن، ئەو رۆژە خەریك بوو لە خەم و خەفەتدا دڵم بوەستێت.ئاواتم دەخواست کە بنێرێت بە شوێنمدا بۆ ئەوەی ڕاز و نیازی خۆمی لەگەڵدا باس بکەم. کاتێك سەرلە ئێوارە گەڕامەوە پێیان وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردوویت.

لە دڵی خۆمدا وتم: خوا یار بێت ئاواتەکەم دێتە دی... چوومە خزمەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ رووی تێکردم و فەرمووی: ئەی ڕەهەم دوێنێ تۆ بە پاژنەی پێت بە توندی ئازارت دام، منیش بە کلکی قامچییەکەم لێمدایت، ئێستا بۆ ئەوە بانگم کردوویت، لەبەرامبەر لێدانەکەمدا ئەو مەڕ و ماڵاتە بەریت و گەردنم ئازاد بکەیت.

ئەبو ڕەهەم ئاواتەکەی هاتە دی، رەسوڵی خۆشەویست ڕێزو دەستی حورمەتی نایە سەری و دڵی دایەوە،بۆیە ئەبو رەهەم لە خۆشیدا خەریك بوو باڵی دەکردەوە و بەدەم خۆیەوە دەیوت: ڕەزامەندی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ من لە هەموو موڵك و ماڵی دنیا خۆشەویسترە.

دیداری سی و یەك

## پرچەکەی (ئەبو مەحذورە)

لە ناوچەی جەعرانە کابرایەك بە ناوی (ئەبو مەحذورە) موسڵمان بوو، ئەم پیاوە دەنگی زۆر خۆش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فێری بانگدانی کرد،پاشان نوسراوێکی نوسی بۆ کاربەدەستەکەی شاری مەککە بە ناوی (عیتابی کوڕی ئەسید)و داوای لیٚ کردبوو (ئەبو مەحذورە)بکات بە بانگدەری (مسجد الحرام)، دوای ئەوە (ئەبو مەحذورە) بانگدەری (مسجدالحرام)بوو، پاشان منداڵەکانی و کوڕەزاکانی جێگەی (ئەبو مەحذورە)یان گرتەوە.

جارێکیان (ئەبو مەحذورە) بانگی دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوێی لە دەنگەکە بوو بوو، بەو شێوازە خۆشە بانگ دەدات، بانگی کردبوو، دەستی پیرۆزی هێنابوو بەسەر سەری (ئەبو مەحذورە)دا.

(إبن محيرين)دەڵیٚ: پاش ماوەیەکی زۆر (ئەبو مەحذورە)م بینیەوە قژی زۆر درێژ بووبوو،منیش پێم سەیر بوو وتم: مامە گیان ئەوە بۆچی کەمێك قژی سەرت کورت ناکەیتەوە؟

(ئەبو مەحذورە) لە وەڵامدا وتی: چۆن دڵم دێڵی تاڵە موویەك ببڕم دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوای بەرکەوتبیٚ و دوعای خێری بەسەردا خوێندبیٚ.

(إبن محيرين)دەڵیٚ: ئەم پیاوە واتە (ئەبو مەحذورە) پێشی سەری ئەوەندە درێژ بووبوو بە دانیشتانەوە کە بەری دەدایەوە دەگەیشتە زەوی.

ئینجا تێبینی بکەین.. پێغەمبەرێك ﷺ ئەوەندە جێگەی لە دڵی هاوەڵانیدا کردبێتەوە مرۆڤێکی وەها، ئەوەندە پێغەمبەری خۆش بوێت،دەبیٚ چۆن هەموو رق و کینە و چاوچنۆکییەکان لەناویدا نەتوێنەوە و تەفر و تونا نەبن ، ئەمەیە ئەم ئاگری خۆشەویستییەی مرۆڤەکانی کاروانی مەحببەت سەوداسەری خۆی دەکات.

دیداری سێ و دوو

## لە خۆم خۆشەویستتر

(نەضیری کوڕی حارثی عەلقەمە)ی قورەیشی،پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوو،کۆچی کرد بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم پیاوە شەو و ڕۆژ سوپاسی خوای دەکرد لەسەر ئەوەی هیدایەتی داوە و، وەکو باوك و براکەی بە موشریکی نەمرد.

لە شەڕی (حونین) ڕزگارکردنی شاری (طائف)دا، پێغەمبەری خوا هەندێك دەستکەوتی دەست کەوت،لەوانە (سەد وشتر)ی نارد بۆ (نەضیر) و پیاوێکی خێڵی (بني الديل)ی لەگەڵدا نارد.

کابرای (دەیلی) وشترەکانی دایە بەر و، لە دوورەوە مژدەی دا بە (نەضیر) کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵاتی کردووە.

(نەضیر) وتی: وەری ناگرم، چونکە وا هەست دەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دیارییانەی بۆ ڕاگیر کردنی دڵی من ناردووە، منیش نامەوێت لە بەرامبەر موسڵمان بوونمدا هیچ دیارییەك وەربگرم.

کابرای دەیلی پێی وت: سوێند بێت نە داوات کردووە، نە بۆی پاڕاویتەوە، ئەمە خەڵاتێکی پێغەمبەری خوایە بۆ تۆ، پەیوەندی بەوەوە نییە.

ئینجا (نەضیر) دیارییەکەی وەرگرت و دە وشتریشی لێ دا بە کابرای دەیلی.

پاشان (نەضیر) چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لەگەڵیدا دانیشت، هەندێ پرسیاری دەربارەی کاتەکانی نوێژ لێ کرد،هەستا هاتە دەرەوە، کاتێ (نەضیر) هاتە دەرەوەوتی: سوێند بێت کە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە لام خۆشەویست بووە، لە خۆم زیاتر خۆشەویستی چووە دڵمەوە.

دیداری سی و سێ[٢]

## دەنگێکی بەرز و هەستێکی ناسك

(ثابت ی کوڕی قەیسی ئەنصاری) موسڵمانێکی ڕاستەقینە بوو، لە کاتی قسەکردندا دەنگی زۆر گڕ و گەورە بوو، کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە﴿یا أیها الذین آمنوا لا ترفعوا أصواتکم فوق صوت النبي و لا تجهروا له بالقول کجهر بعضکم لبعض أن تحبط أعمالکم وأنتم لا تشعرون﴾، (ثابت) دەستی کرد بە گریان و لە خەفەتدا نەخۆش کەوت.

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پرسی، وتیان نەخۆشە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و پێی فەرموو:ئەو چیتە (ثابت)؟

ئەویش وتی:ئەی پێغەمبەری خوا دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە من لەرزم لێ نیشتووە ئەترسم ئەوەندە دەنگم بەرز بووبێ هەموو کردەوەکانی بەتاڵ کردبێتەوە، پێغەمبەری خوا زۆر دڵخۆشی دایەوە و سوپاسی بۆ کرد و دوعای خێری بۆ کرد.

## دیداری سی و چوار

# هاوسەرەکەی جولەیبیب

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەگێڕێتەوە:

جولەیبیب یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پیاوێکی کورتەباڵای دەم و چاو ناشرین بوو،جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و پێی فەرموو: جولەیبیب بۆچی ژن ناهێنیت؟

جولەیبیب وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆت دەمبینیت ئەوە حاڵمە و هەژاریشم کێ ژنم دەداتێ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جولەیبیب تۆ لای خوا هەژار نیت و ڕێزت هەیە و،ناشرینیش نیت، خوای گەورە سەیری دڵان دەکات،.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە زانی گرفتەکە چییە، چوو خوازبێنی کچە ئەنصارییەك بۆ جولەیبیب،ماڵی باوکی کچەکە لەبەر داخوازییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بوون، بەڵام لە دڵەوە هەستیان ئەکرد کە کچەکەیان شووی بە هاوشانی خۆی نەکردووە.

کچەکە ژیر و وریا بوو، کە هەستی بەم حاڵە کرد، چووە لایان و قسەی باشی بۆ کردن و پێی وتن: خوای گەورە فەرموویەتی:(وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله و رسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم)، واتە:(نابێ و ڕەوا نییە بۆ هیچ ئیماندارێك ژن بێت یان پیاو کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانیان لەسەر شتێك دا ئەوان ئیختیارێکی تر بکەن).

بۆیە کچەکە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێیوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بەم کارە ڕازیم و خۆم تەسلیم بە ئەمری پێغەمبەری خوا کردووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە ناز و نیعمەتی خۆت بڕژێنی بەسەر ئەم ئافرەتەدا،

هەرگیز هەژاری بە خۆیەوە نەبینێت..دوای ئەوە (جولەیبیب) تەنها چەند ڕۆژێك لای خێزانی مایەوە و لەگەڵ بانگ و صەدای جیهادکردندا هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەرچووە دەرەوە و لە جەنگێکدا شەهید کرا..دوای شەهید بوونی جولەیبیب، خێزانەکەی بووە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی ئەنصار و لە هەمووشیان زیاتر خەرجی و پارەی لە پێناوی خوادا دەبەخشی.

## هەواڵی ڕاست

جولاسی کوڕی سویدی صامد کابرایەکی دووڕوو بوو، ئیبن ئیسحاق دەڵێ:

جولاس یەکێك بوو لەوانەی بەشداری نەکردبوو لە غەزای تەبوکدا و لە شوێنێکدا گوتووبووی: (سوێند بێت ئەگەر ئەم پیاوە ڕاست بکات ئەوا ئێمە لە گوێدرێژ خراپترین).

کاتێك ئەم قسەیەی کرد کوڕی ژنەکەی لە مێردێکی تر ناوی (عومەری کوڕی سەعید)بوو لەوێدا گوێی لەو قسەیەی جولاس بوو، بە جولاسی وت بەڕاستی تۆم خۆش دەوێت و چاکەی زۆرت بە سەرمەوە هەیە نامەوێت توشی هیچ زیانێك بیت،بەڵام وتەیەکت لەدەم دەرچوو ئەگەر بۆ پێغەمبەری خوای بگێڕمەوە ئابڕووت دەچێت، ئەگەر نەشیگێڕمەوە دینەکەم دەفەوتێت، گومانیش نییە کە یەکەمیان ئاسانترە لە دووەمیان.

عومەر هەستا و قسەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەقاودەق گێڕایەوە،جولاس حاڵی پەرێشان بوو، جێگەی بە خۆی نەدەگرت،چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە پاکانەکردن و سوێند خواردن لەسەر ئەوەی کە ئەم قسەی وای نەکردووە و عومەر درۆی بەدەمەوەکردووە.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دەربارەی نارده خوارەوە:( يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَهُمْ وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ )

واتە:(ئەو دووڕووانە سوێند دەخۆن کە شتی وایان نەوتووە، بەڵام بێگومان کە وشەی کوفریان بەدەمدا هات پاش ئەوەی کە ئیعلانی ئیسلامەتی خۆیان کردبوو، بەنیاز بوون ئەوە بکەن کە بۆیان ئەنجام نەدرا،

ئەو تۆڵە و داخ و کینەیەی دڵیان لە بەرامبەر ئەو ڕێز و فەزڵەدا بوو کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بەسەریاندا ڕژاندبوویان،ئەگەر ئەوانە تەوبە بکەن ئەوا باشترە بۆیان، خۆ ئەگەر مل نەدەن و پشت هەڵبکەن ئەوا خوای گەورە سزایەکی ئازاردەری بۆ ئامادە کردوون لە دونیا و لە قیامەتدا و لەم زەوییەشدا هیچ پشتیوان و فریادرەسێکیان نابێت).

کاتێك جولاس گوێی لەم ئایەتە پیرۆزە بوو خێرا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی وت:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا دێتە بەر گوێم کە خوای مەزن مۆڵەتێکی تری تەوبەی بە من بەخشیبێت،ئایا دەکرێت تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای خودا؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

ئەویش وتی: ئێنجا ئێستا منیش دان بەوەدا دەنێم کە ئەو قسەیەم کردووە و عومەیریش بە ڕاستی قسەکەی گێڕاوەتەوە،پاشان جولاس تەوبەیەکی زۆر باشی کرد و خوای گەورەش لوتفێکی گەورەی لەگەڵدا کرد، ئەوە بوو بە ئیسلامەتی ژیا و لەسەر ئیسلامەتیش کۆچی دوایی کرد.

دیداری سی و شەش

## چاوە پڕ لە فرمێسکەکان

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆهەمی کۆچیدا،پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا غەزای وڵاتی ڕۆم بکات، لە تۆڵەی ئەو شەڕە نابەرابەریدا کە لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەردا کردبوویان لە جەنگی (مؤتە)دا،فەرمانی دا کە موسڵمانان خۆیان کۆکەنەوە بۆ شەڕێکی دوور، ڕۆژان ڕۆژێکی هاوین و گەرم بوو،دەشت و دەر لە تاو تینی گەرما هەڵمی لێ هەڵدەسا و، مرۆڤ حەزی لە ژێر سێبەری باخ و دارخورماکانی دەکرد،پێیان خۆش نەبوو کەس داوایان لێ بکات ئەو هەوارگە فێنکانە بەجێ بهێڵێت بۆ هەر مەبەستێك بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ پیشەی وا بوو، بۆ هەر شەڕێك بچووایە ئاشکرای نەدەکرد کە بۆ کوێ دەچێت بۆ ئەوەی لایەنی ئەمنی سوپای موسڵمانان پارێزراو بێت،بەڵام لەم شەڕەدا بە ئاشکرا فەرمووی کە بۆچی دەچێ و بۆ کوێ دەڕوات و نیازی چییە!، چونکە ماوەی نێوان مەدینە و شوێنی مەبەست زۆر درێژ بوو،ڕێگاوبانیش زۆر سەخت و دژوار بوو، گەرمای ڕێگەکەش بە تەواوی مرۆڤی وەڕس دەکرد، دوژمنانیش لەبەرامبەردا ژمارەی زۆر بوو، بۆیە دەبوایە ئەمیش زۆرترین ژمارە کۆبکاتەوە، هەتا بتوانێت ڕووبەڕووی ئەو سوپا گەورەیەی ڕۆمەکان ببێتەوە.

بۆیە هەواڵی دا بە خەڵکی کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی ڕۆمەکان.

شاری مەدینە کەوتبووە جموجۆڵێکی نائاسایی و،خەڵك لەناو شاردا لە خۆ ئامادەکردنێکی سەیردا بوون، شار جمەی دەهات، دوو ڕووەکانیش خەریکی خۆشاردنەوە و پاکانە کردن بوون، و دەیان ویست خۆیان کەنار بدەن و لە دوورەوە گومان و دڵەڕاوکێش بۆ موسڵمانان دروست بکەن.

لەولاشەوە پۆل پۆل دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا و عوزریان بۆ دەهێنایەوە کە ناتوانن بەشداری بکەن.

ئەوەی کە هانی موناففقەکانی دا بۆ ئەو کارانە کابرایەکی یەهودی بوو بە ناوی (سولەیم)ەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هانی دەوڵەمەندان و دەست ڕۆشتووەکانی ئەدا کە خەرجی بدەن لە پیناوی خودا و، ئاینی ئیسلام سەربخەن.

هەندێك لە موسڵمانە دەوڵەمەندەکان بە سواری وشترەکانیان هەژارەکانیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت،عوسمانی کوڕی عەففان لەو ڕۆژەدا خەرجییەکی خەرج کرد کەس شتی وای نەکردبوو،هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی: (خوایە... من لە عوسمان ڕازیم، تۆش لێی ڕازی بە).

هەندێك لە هاوەڵان بەهانەی شەرعییان هەبوو، لەبەر نەبوونی نەیاندەتوانی لەو شەڕەدا بەشداری بکەن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دان و ئەوانیش بەدەم هەنیسکی فرمێسکەوە دەگەڕانەوە ماڵێ، چونکە نەیان دەتوانی بەشداری لەو خێرە گەورەیەدا بکەن.

دیداری سی و حەوت

## براکەتانم بدەنە دەست

عوبەیدوڵا موزنی هاوەڵێکی پێغەمبەر بوو ﷺ،کە لە کاتی خۆیدا نەیانتوانیبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرەو شاری مەدینە کۆچ بکات.

خێڵی قورەیش و خزمەکانی عوبەیدوڵا زۆر ئازاریان دەدا،بەرگێکی زبر و تیژیان لەبەر دەکرد تێیان دەئاڵاند تا زیاتر ئازار بچێژێ، جارێکیان هەلی بۆ رەخسا و بەو حاڵەوە رایکرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لە رێگا بەرگەکەی کرد بە دوو پارچەوە پارچەیەکیان عەورەتی پێ داپۆشی، پارچەکەی تریشیانی دا بەسەر شانیدا، بەم حاڵە گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ناویان لێ نا (ذي البجادين) لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆی سازدا بۆ جەنگی (تەبووك).

عەبدوڵای کوڕی مەسعود کە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: جارێکیان لە کاتی نیوە شەودا لە خەو هەستام، لە قەراغی سەربازگەکەمانەوە چاوم بە تروسکایی ئاگرێك کەوت، لێی نزیك بوومەوە، سەیرم کرد پێغەمبەری خوایە ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر رضي الله عنهما خەریکی هەڵکەندنی گۆڕێکن، وتم: ئەبو بەکر ئەوە کێیە وەفاتی کردووە؟، وتی: ئەمە عوبەیدوڵای موزنییە، لە رێگادا کۆچی دوایی کردووە!.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو گۆڕەکەدا بوو فەرمووی: ئادەی براکەتانم بدەنە دەست.

دایانە دەستی و ئەویش بە دەستی موبارەکی خستیە گۆڕەکەوە.

ئیبن مەسعود دەڵێ:گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی دەخوێند: (اللهم إني أمسيت راضيا عنه، فارض عنه)، واتە:(خوایە... من لەم مرۆڤە ڕازیم، تۆش لێی ڕازی بە).

عەبدوڵا دەڵێ: لە ناخی دڵمەوە ئاواتم دەخواست لەجیاتی ئەو مردووە من بومایە و بەر ئەو دوعایەی پێغەمبەر بکەوتمایە.

## مژدەی ڕاست

عەدی کوڕی حاتەمی طائی دەگێڕێتەوە:

باوەڕ ناکەم لە ناو عەرەبدا هیچ پیاوێك هەبێت لە کاتی بیستنی ناوی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەندەی من ڕقی لەو زاتە بووبێت، من پیاوماقوڵێکی ناو خێڵەکەی خۆم بووم،نەصرانی بووم،ئەوەندەیان ڕێز لێ دەگرتم کردبوومیانە سەرۆکی خۆیان، چوار یەکی مەڕ و ماڵاتی خۆیانیان دەدامێ،لەبەر ئەوەی لە ناو گەلەکەمدا ئەو شان و شەوکەتەم هەبوو،کاتێك بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ ئاینێکی نوێی هێناوە لە دڵەوە زۆر ڕقم لێ هەڵدەستا.

جارێکیان خزمەت کارەکەم بانگ کرد، کوڕێکی عەرەبی دەشتەکی بوو ، پێم وت: بڕۆ ژمارەی وشترەکانم بۆ بژمێرەو قەڵەو و لاوازەکانم بۆ جیا بکەرەوە و لە نزیك خۆمەوە مۆڵیان بدە،کاتێك کە گوێت لێ بوو سوپای موحەمەد بڵاو بۆتەوە، هەواڵم بدەرێ،

کاتێك هەواڵ هات کە سوپای موسڵمانان نزیك بۆتەوە، خزمەتکارەکەم لەبەرەبەیانیدا هەواڵی دامێ و پێی وتم: عەدی چی دەکەیت ئەوا سوپاکەی محمد دایان بە سەرتا، وریای خۆت بە. لە دوورەوە ئاڵا و دروشم و ژمارەی سوپای (محمد)م بەدی کرد، بەرەو ئێرە بەڕێوەن.

عەدی دەڵێ: وتم: وشترەکانم بۆ بهێنە.

بۆی هێنام ژن و مناڵەکانم سوار کرد و، وتم:دەمەوێت بگەم بە کەس و کارم لە وڵاتی شام و لەسەر دینەکەی خۆم بمێنمەوە،باوکم لە ژنێکی تری کچێکی تری هەبوو بە ناوی (سیڤانە) کە ئافرەتێکی وریا و هۆشیار بوو،ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا، دەستبەسەرمان مەکە،

خوا پاداشتت بداتەوە چونکە ئافرەتێکی بێکەسم، باوکم تیا چووە براکەم بەجێی هێشتم و سەری خۆی هەڵگرتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: براکەت کێیە؟

سیڤانە وتی: عەدی کوڕی حاتەمە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە لە خوا و پێغەمبەرکەی رای کردووە؟

سیڤانە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کاتە هیچی نەوت، ڕۆشت و بۆ سبەینێ هاتەوە و هەمان قسەی پێ وتمەوە، منیش وەڵامم دایەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکی تر گوزەری کردەوە، لەوە بێ ئومێد بووم کە هیچم بۆ بکات،پیاوێك لە پشتیەوە وەستابوو، بە دەست ئیشارەتی بۆ کردم کە هەستم و جارێکی تر قسەی لەگەڵدا بکەمەوە،منیش هەستامەوە و بە هەمان شێوەی جارەکانی تر قسەم کردەوە، لە دواییدا تکام لێ کرد کە چاکەیەکم لەگەڵدا بکات،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (خەمت نەبێت چاکەت لەگەڵدا دەکەم، پەلەم لێ مەکە هەتا کەسێك لە خزمەکانی خۆت دەدۆزیتەوە، متمانەی پێ بکەیت ئەتدەمە دەستی ئەو بتگەیەنێتەوە دەستی براکەت، هەر کاتێك کەسێکی وات دەست کەوت ئاگادارم بکەرەوە).

سڤانە دەڵی: هەستام چوومە لای ئەو پیاوەی کە لە پشت پێغەمبەرەوە بوو، پرسیم کێیە؟ وتیان: (علی کوڕی ئەبو طالب)ە.

هەندێك لە خزمەکانمان لە کاروانێکدا هاتبوون و منیش خێرا چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئاگادارم کردەوە کە هەندێك لە خزمەکانم هاتوون و کاتی ئەوە هاتووە مۆڵەتم بدەیت.

پێغەمبەری خوا ﷺمۆڵەتی داو جل و بەرگی باشی دایە و،سواری وشتری کرد و خەرجی ڕێگەشی دایە، بۆ ئەوەی پێویستی بە هیچ نەبێت،سیڤانە بە سەلامەتی گەیشتەوە وڵاتی شام.

عەدی دەڵێ: ڕۆژێکیان لەماڵەوە دانیشتبووم، سەیرم کرد کاروانی (ظعینة) بەرەو لای ئێمە دێت،سیڤانەم لە کاروانەکە بەدی کرد،باوەڕم نەدەکرد وتم: تۆ بڵێی ئەوە خۆی بێت؟!!،بەڵام ئەو خێرا لە وشترەکە دابەزی و خێرا بەرەو رووم هات و دەستی کرد بە قسە پێ وتنم، وتی: ئەی زاڵم، هەی بێ ڕەحم، خۆت و منداڵەکانت قوتار کرد و منت بەجێ هێشت، هەر لەبەر ئەوەی لە دایکی تۆ نەبووم!.

عەدی وتی: خوشکەکەم تکات لێ دەکەم.. قسەم پێ مەڵێ،قسەی چاك بکە سوێند بێت هیچ عوزرێکم نەبوو، ئیعتراف بە تاوانی خۆم دەکەم. پاشان سیڤانە لای عەدی نیشتەجێ بوو.

عەدی ڕۆژێکیان بە خوشکەکەی وت: خوشکی خۆم تۆ باوەڕت بەو پیاوە چۆنە؟ مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

سیڤانە وتی: من باوەڕم وایە، بە خێرایی بچیت بۆ لای و ئیعلانی ئیسلامەتی خۆت بکەیت، ئەگەر پێغەمبەر بوو ئەوا سەرفراز دەبیت و، فەزیڵەتیش بۆ ئەو کەسەیە کە زووتر دەڕواتە خزمەتی. ئەگەر مەلیکێکی دونیاش بوو ئەوا هیچت لەدەست ناچێت، تۆ هەر بە سەربەرزی خۆت لە خاکی یەکەمدا دەمێنیتەوە.

عەدی وتی: سوێند بێت ئەمە بۆچوونێکی باشە.

ئەوە بوو بەرەو لای پێغەمبەری خوا کەوتە ڕێ بۆ شاری مەدینە.

عەدی دەڵێ: چوومە ناو مزگەوت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ دانیشتبوو، سەلامم لێ کرد و وەڵامی دامەوە و فەرمووی:/ تۆ کێیت؟.

وتم : عەدی کوڕی حاتەم.

دەست بەجێ پێغەمبەر ﷺ هەستایە سەر پێ و لەگەڵ خۆیدا بردمیەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

لە دڵی خۆمدا وتم دەبێ کارێکی پێم هەبێ و مەبەستی هەبێ.

لە ڕێگەدا پیرێژنێکی لاوازی پێگەیشت،وەستاندی و قسەی لەگەڵدا کرد، بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا وەستا.

وتم: سوێند بێت بە خوا ئەمە مەلیك نییە، ئەگەر مەلیك بووایە ئەوەندە بێ فیز نەدەبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لێ کردم،کە چووینەماڵەوە تەنها پێخەفێکی هەبوو، خستیە بەردەمی من و فەرمووی لە سەری دابنیشە.

منیش وتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا خۆت لەسەری دابنیشە.

ئەو فەرمووی: نەخێر هەر دەبێت تۆ لەسەری دابنیشیت.

منیش بە ناچاری لەسەری دانیشتم و ئەو لەسەر زەوییەکە دانیشت، جارێکی تر دڵم خورپەی کردەوە، ئەی هاوار کەی ئەمە هەڵسوکەوتی مەلیکە... هەر دەبێت ئەم پیاوە پێغەمبەر بێت.

پێغەمبەرﷺرووی تێ کردم و فەرمووی:عەدی تۆ لەسەر دینی(رکوسی) بویت؟ رکوسی بیروباوەڕێکە لە نێوان نەصرانی و صابئییەکاندا-منیش وتم: بەڵێ.

فەرمووی: ئایا تۆ لە ناو قەومەکەتدا چواریەکی ماڵت لێ وەرنەدەگرتن؟.

وتم: بەڵێ.

فەرمووی: ئەوە لە دینەکەی خۆتدا حەڵاڵ نەبوو.

عەدی دەڵێ: سوێند بە خوا لەو پرسیارانەوە زانیم کە پێغەمبەرەو مەلیك نییە. چونکە ئەو مەسەلانە هیچ کەس لە موسڵمانان پێ‌ی نەدەزانی.

پاشان پێغەمبەر رووی تێکردم و فەرمووی: عەدی تۆ لەوانەیە لەبەر هۆیەك بێت کە ناتەوێش شوێنی ئەم دینە بکەویت،لەوانەیە لە ماڵ و سامانەکەت بترسیت، سوێند بێت ئەم ئومەتە ئەوەندە دەوڵەمەند دەبێت حیسابی خۆی نەزانێ،لەوانەیە بیر لە ماڵ و کۆشك و تەلار بکەیتەوە، سوێند بێت موسڵمانان دەبینی کۆشك و تەلارەکانی بابل فەتح دەکەن.

کە ئەم مژدە خۆشانەی پێ دا عەدی موسڵمان بوو باوەڕی بە هەق هێنا.

عەدی دەڵێ: سوێند بێت بە خوای مەزن ، هەموو ئەو مژدانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنی دابوو، بە چاوی خۆم هەموویانم بینی و هاتنە دی،بە ڕاستی (محمد) پێغەمبەری مەزنی خوای گەورە و میهرەبان.

دیداری سی و نۆ

## تاڵە مووەکانی پێغەمبەر ﷺ

لە حەجی ماڵ ئاواییدا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە (هەدی)یەکەی بۆوە، داوای کرد سەرتاشێکیان هێنا بۆ تاشینی قژی پێغەمبەری خوا ﷺ.هاوەڵان هەڵپەیان بوو لەسەر دەستکەوتنی تاڵە مووە پیرۆزەکانی سەر و ڕیشی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەریش ﷺفەرمانی دا سەرتاش لای ڕاستی سەری بتاشێ و مووەکانی بەخشی بە (ئەبو طەلحە) و فەرمووی کێ دەیەوێت بیدەرێ.خەڵکی بە پەرۆشەوە تامەزرۆی حاصلکردنی تاڵە موبارەکی مەزنترین مرۆڤ بوون،پێغەمبەری خواش ﷺ دڵی کەسیانی نەشکاند.

ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه دەڵێ: لەکاتی سەرتاشینەکەی پێغەمبەردا ﷺ چاوم لێ بوو خالیدی کوڕی وەلید لە بەردەمیدا دۆش دامابوو، داوای دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە تاڵە مووەکانی سەری بە کەسی تر نەبەخشێت و بیدات بەو، بە پێغەمبەری گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺدایك و باوکم بە قوربانت بێت، چاوەڕوانی بەخشینی تاڵە مووەکانی قژی سەرتم، تکایە بە منی ببەخشە.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ خالیدی بەو شێوەیە بینی هەموو تاڵە مووە پیرۆزەکانی پێشی سەری پێ بەخشی.

ئینجا خالید دوای ئەوە گرتی بە دەستییەوە ماچی دەکرد و لەسەر چاوی دایدەنا،پاشان گرێی داو لە ناو کڵاوە جەنگییەکەیدا هەڵی گرت.

ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه لە ڕۆژەکانی دوا تەمەن و حاڵەتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا ﷺ تاڵە موویەکی سەری موبارەکی دەرهێنا و بە (ثابت بەنانی) وت:داوات لێ دەکەم ئەگەر مردم ئەم تاڵە مووە بخەرە ژێر زمانم، ئەوە بوو پاش کۆچی مالك،

ثابت وەسیەتنامەکەی بەجێ هێنا و لە کاتی کفن کردنیدا تاڵە مووە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خستە ژێر زمانی مالك و لەگەڵیدا ئەسپاردە کرا.

ئەبو ئەیوبی ئەنصاریش ﷺ تاڵە مووە کانی پیشی موبارەکی هەڵگرت و بە یادگاری لای خۆی هێشتەوە.

دیداری چل

## میوانداری پێغەمبەر ﷺ

ئەبو بەکری صدیق ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا وشترێکی ئامادە کردبوو بۆ کەلوپەلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ،لە کاتێکدا کە لە حەج گەڕانەوە،لە جێگەیەکدا دابەزین بۆ حەوانەوە، ئەبو بەکر داوای خزمەتکارێکی خۆی کرد کە چاودێری وشترەکانیان بۆ بکات،خزمەتکارەکە ئاگای لە خۆی نەبوو وشترەکان دوور کەوتنەوە، کاتێك ویستیان هەستن، ئەبو بەکر بە مەسەلەکەی زانی و کەوتە لۆمە کردنی خزمەتکارەکەی،لەو کاتەدا سەعدی کوڕی عوبادە لەگەڵ قەیسی کوڕیدا پەیدا بوون وشترێکی تریان ئامادە کردبوو بۆ کەلوپەلەکانی پێغەمبەرﷺ.

لەولاشەوە پێغەمبەر ﷺ وشترەکەی دۆزییەوە.

سەعد وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشترەی من وەرگرە لە جیاتی ئەوەی خۆت.

پێغەمبەری خۆشەویست لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا سوپاسی گەرمی کرد و فەرمووی: وشترەکەی خۆمم دۆزییەوە،ئێوەش ئەوەی خۆتان ببەنەوە خوای گەورە پاداشتتان بداتەوە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی فەرموو: (ئەبو ثابت)-کە ئەمە شۆرەتەکەی بوو- ئایا ئەوەت بەس نییە کە تۆ هەموو ڕۆژێك میوانداری من دەکەیت و زەحمەتم لەگەڵدا دەکێشیت؟

سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منەت تەنها بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، سوێند دەخۆم بە خوای گەورە ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەو ماڵەی کە تۆ وەری دەگری لە لامان گەلێك خۆشەویستترە لەو ماڵەی کە ڕەتی دەکەیتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی سەعد تۆ مرۆڤێکی ڕاستگۆیت، (ئەبو ثابت) مژدەت لێ بێت ڕزگارت بووە،ئەوەش بزانە پشکەکانی خێر بە دەستی خوایە ئەگەر خواستی لەسەر بوو دەیبەخشێ بەو عەبدە صاڵحەی کە خۆی دەیەوێت.

سەعد وتی: الحمد لله کە خوا نیعمەتی بەسەردا ڕژاندووم.

لە ڕاستیدا سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ لەو ڕۆژەوە پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە خزمەتی ماڵەکەی کرد،هەتا کۆچی دوایی کرد، هەموو ڕۆژێك سینیەك خواردنی پڕ لە گۆشتی دەنارد بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ،تەنها ڕۆژێکیش ئەو سینیە خواردنە لە ماڵی پێغەمبەر نەبڕاوە ﷺ،ئەو خواردنە یەك یەك بەسەر ژورەکانی پێغەمبەردا دەگەڕا ﷺ،هەموو شێوانێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ نانی ماڵی سەعدی دەخوارد، یان خواردنەکەی خۆی هەڵدەگرت دەیدا بە هەژارانی (ئەهلی صفە).

ئەو کاتەش کە پێغەمبەر ﷺ لە دەرەوەی شار بووایە،یان جەنگێك بووایە سەعدی لەگەڵدا بووایە، سینییە خواردنە کەلە ماڵەکانی نەدەبڕا.

سەعد لە نان بدەییدا مرۆڤێکی گەورە بوو، هەندێ جار خواردنی سوپاکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە تەواوی دابین دەکرد.جارێکیان بە قەیسی کوڕیدا (٣٠) بارە خورمای بە (٣٠) وشترەوە نارد بۆ ئەو موسڵمانانەی لە جەنگی (صحراء الآسد)دا بەشدارییان کرد، هەروەها جەنگاوەرەکانی جەنگی (بەنی قورەیزە)ی دابین کرد، لە جەنگی (ذي قرد)یشدا دەیان باری وشتر خورماو خواردنی تری نارد بۆ موسڵمانان و دە وشتری لە ڕێگەی (قەیس)ی کوڕیەوە بۆ سەربازگەیەکی موسڵمانان سەربڕی، سەرەڕای ئەوەی کە خۆی و (٣٠٠) کەس لە عەشیرەتەکەی پاسەوانی شاری مەدینەیان دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ جارێکیان قەیسی بانگ کرد و پێی فەرموو: قەیس بەڕاستی باوکت تۆی کردە شۆڕە سوار و،دڵی هەموو مجاهیدانی ئارام کردووە و، شاری مەدینەشی لە دوژمنانی خوا پاراست. ئینجا دەستی نزای بەرز کردەوە و فەرمووی: خوایە ڕەحم بکەیت بە سەعد و خزم و خوێشەکانی.

پاشان فەرمووی: بەڕاستی سەعد پیاوێکی زۆر چاکە.

ئەم شایەتییەی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەعد گەورەترین مەدالیای ڕێز و حورمەتە، دەکرێتە ملی سەعد و پێی شکۆمەند دەکرێت،چەندە مەزنە پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرموێت: بە ڕاستی سەعد پیاوێکی چاکە.. ئەمە مانای لوتف و ڕەزامەندی خوا دەگەیەنێت... ئەمەش مەبەستی سەرەکی ناخی سەعد بوو.

## با کفنەکەم بەرگی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت

سەهلی کوڕی سەعد رضي الله عنه دەڵێت:

جارێکیان ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بوردەیەکی بە دەستی خۆی بۆ چنیبوو، هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی بەخشی، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاسی کرد و دوعای خێری بۆ کرد، بوردەکەی لەبەر کرد و هاتە دەرەوە بۆ ناو هاوەڵان،پیاوێك هاتە خزمەتی و داوای لێ کرد کە بیداتێ،پێغەمبەریش ﷺ لەبەر ئەوەی داوای هیچ کەسێکی ڕەت نەکردەوە،خێرا بوردەکەی داکەند دایە دەستی کابرا،موسڵمانان لەوێدا وەستابوون، لۆمەی کابرایان کردو پێیان وت: کارێکی باشت نەکرد، چونکە تۆ دەزانیت داوای هیچ کەس ڕەت ناکاتەوە.

کابرا وتی: سوێند بێت بە خوا، تەنها بۆ ئەوە داوام کرد کە بیکەمە بەرگی کفنەکەم و بەم شێوەیە بڕۆمە حزوری خوا.

سەهلی کوڕی سەهد کە ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پاش ماوەیەکی کەم کابرا کۆچی دوایی کرد.. بوردەکەی بۆ کرا بە بەرگی کفنەکەی و پێیەوە نێژرا.

ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت.

دیداری چل و دوو

## دوا ساتەکانی پیغەمبەر و خورپەی دڵی

ئەنەسی کوڕی مالیك کە ماوەیەکی زۆر لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو، دەگێڕێتەوە: ڕۆژی دووشەمە ئەو ڕۆژە بوو کە بۆ دوا جار پێغەمبەری خوا ﷺ چاوە پیرۆزەکانی لێك ناو،بەرەو مەنزڵگای هەمیشەیی بەهەشتی بەرین و خزمەت بارەگای خوا، کۆچی مەزنی خۆی کرد.

پێش ئەوە لە نوێژی، موسڵمانان خەم و خەفەتی نەخۆشییە سەختەکەی پێغەمبەر ﷺ بەردڵی گرتبوون و،هەموویان لەگەڵ خورپەی تەنگ هاتووی دڵەکانیان نوێژیان لە خزمەت ئەبو بەکردا دابەستبوو، ئەبو بەکر ئیمامەتی بۆ دەکردن، هێشتا لە نوێژ نەبۆتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو دەرگایەوە کە دەیڕوانییە ناو حەرەمی مزگەوت،سەرێکی لادا و موسڵمانان لە نوێژەکەدا هەستیان پێ کرد،لە خۆشییانە خەریك بوو هەموویان نوێژەکە بیڕن. ئەبو بەکریش لە ئیمامەتیەکەیدا کەمێك هاتە دواوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕواتە پێشەوە،پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ئیشارەتی کرد نوێژەکەیان نەبڕن و بەردەوام بن. دەرگاکەی کردەوە هاتە ژوورەوە،بەدەم زەردەخەنەوە سەیرێکی ڕیزەکانی کردن، ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەڵێت سوێند بێت بە خوای گەورە ئەو ڕۆژە دەم و چاوی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە جوان و درەوشاوە بوو، دەتووت پەڕەی سپییە.

ئەبو بەکری کوڕی (إبن مليكة) دەڵێت:ئەبو بەکر کە زانی خەڵکی شەوق و خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەر جوڵاوە، لە شوێنی نوێژەکەی کەمێك هاتە دواوە، ئەو هەستە ناسکەی ئەبو بەکر لەو کاتەدا تەعبیرە لەسەر ئەو حاڵە ویژدانییە مەزنەی هەیەتی بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ.

بۆیە پێغەمبەری خۆشەویست، خێرا ئەو حاڵە پڕ لە سۆزەی ئەبو بەکر دەخوێنێتەوە و دەستی موبارەکی دەدا لە پشتی و پێی دەفەرموویت: بڕۆ پێشەوە و نوێژەکەیان بۆ تەواو بکە. خۆیشی لەبەر ئەوەی سەری زۆر ئازاری هەبوو، بە دانیشتنەوە لە لای ڕاستی ئەبوبەکرەوە نوێژی دابەست. کە لە نوێژ بوونەوە رووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: خەڵکینە ئاگری دۆزەخ تاو دراوە، فیتنەی ئاژاوە بەڕێوەیە وەك شەوگاری شەوە زەنگ داتان دەپۆشێت،ئەوەش بزانن کە من ئەوەی بۆم حەڵاڵ کردوون حەڵاڵی قورئان و کەلامی خوایە،ئەوەش کە حەرامم کردووە، حەرامی قورئانە .

پاش کەمێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارەکەی بۆوە، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینم سوپاس بۆ خوا حاڵت زۆر باشە و،بەو شێوەیە کە ئێمە پێمان خۆشە بتبینن، ئینجا مۆڵەتی لێ وەرگت و چووە دەرەوە.

فەزڵی کوڕی عەباس ﷺ ئامۆزاکەی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆژی نەخۆشییەی پێغەمبەر ﷺ لە تاو ئازار سەری بەستبوو، زۆر بێتاقەت بوو،پێی فەرمووم: فەزڵ... دەستم بگرە.

فەزڵ دەڵێ: دەستیم گرت، هەتا چووە سەر مینبەرەکەی، فەرمووی: بانگێك بکە خەڵکی و بڵێ: (الصلاة جامعة)، واتە: (کۆببنەوە بۆ نوێژ).

فەزڵیش هاواری کردە خەڵك و زۆرێك لە موسڵمانان کۆبوونەوە،پێغەمبەر لە مینبەرەکەیەوە کەوتە دواندن بۆ خەڵك و پاش حەمد و سەنای خوا فەرمووی:

خەڵکینە... وا هەست دەکەم لە وادەیەك نزیك دەبمەوە و، جارێکی تر ئێوە لەم مەقامەدا من نابیننەوە، بە چاکم زانی کە لەگەڵتاندا بۆ دواجار گفتو گۆ بکەم و ئەوەی پێویستە راستی بکەمەوە، خەڵکینە هەرکەسێك هەقی لە لامە با بێت وەری بگرێتەوە،هەر کەسێك دارێکم لە پشتی داوە ئەوە پشتم با هەقی خۆیم لێ بکاتەوە، ماڵی هەر کەسێکم لەلایە با بێت و وەری بگرێتەوە،ئەگەر قسەشم بە هەر کەسێك وتووە با ئێستا بێت و قسەکانم پێ بڵێتەوە،

وە مافم لای هەر کەسێکی ئێوەش هەبێت، گەردنی هەمووتان ئازاد بێت،من دڵم ڕق و کینەی تێدا نییە،حەز دەکەم بە سینەیەکی زۆر سافەوە بچم بۆ حوزوری خواکەم و مافی کەسم لە لا نەبێت.

پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سێ درهەمم لە لاتە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

من هیچ قسە کەرێك بە درۆ ناخەمە و سوێندیشی نادەم، بەڵام پێم بڵێ ئەو سێ درهەمە کەی بە منت داوە؟

پیاوەکە وتی: ئایا بیرت دێت جارێکیان پیاوێك داوای پارەی لێ کردیت بە منت فەرموو: تۆ بیدەرێ، منیش پارەم دایە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەزڵ پارەکەی بدەرەوە.

پاشان رووی کردە حەشامەتەکە و فەرمووی:ئەی خەڵکینە کێماڵی دەستکەوتی لایە با بیگەڕێنێتەوە بۆ (بیت المال).

پیاوێك هەستا و وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من سێ درهەمم لە دەستکەوت بردووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەزڵ لێی وەربگرە.

پاشان فەرمووی:خەڵکینە هەر کەسێك لە ئێوە لە ناخیدا حەزێکی هەیە با هەستێ و پاشان منیش دوعای بۆ بکەم.

خێرا (عوکاشەی کوڕی محسن) هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوات لێ دەکەم نزام بۆ بکە کە لە بەهەشتدا لەگەڵ تۆدا بم.

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد فەرمووی: تۆش یارمەتیم بدە بەوەی سوژدە زۆر بۆ خوا ببەیت.

پیاوێکی تر هەستا وتی: منیش دەمەوێت لە بەهەشتدا لەگەڵتا بم.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: تازە لە نزاکەدا پێش کەوت.

پاشان پیاوێکی تر هەستا و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکی دووڕوو و درۆزن و خەواڵووم..

عومەری کوڕی خەتاب لەوێدا وەستابوو وتی: ئەرێ کابرا.. خوا نهێنی تۆێ پۆشیوە بۆچی ئابڕووی خۆت دەبەیت؟!.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر خۆبە عومەر،ئابڕووچوونی دنیا ئاسانترە لە ئابروو چوونی ئاخیرەت،پاشان دەستی نزای بەرز کردەوە فەرمووی: خوایە بیکەیتە مرۆڤێکی ڕاستگۆ و ئیمانێکی بەهێزی پێ ببەخشیت و لە دەردی خەوە نوچکەیەتی ڕزگاری بکەیت ئەگەر ویستت لەسەر بوو.

## دیداری چل و سیٚ

# ئەی هاوار بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت:

تازە بە تازە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کردبوو،عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه سەری لیٚ شێوابوو ،ئۆقرەی بە خۆی نەدەگرت دەهات و دەچوو،دڕی بە خەڵکەکە داو هاواری کرد: ئەوە چییە،کۆمەڵێك دووڕوو پڕوپاگەندە بڵاو دەکەنەوە دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە،، سوێند بێت بە خوا، پێغەمبەر ﷺ هێشتا نەمردووە،بەڵکو وەك (موسای کوڕی عیمران) چووە بۆ لیقائی خوا و دەگەڕێتەوە.

سوێند بیٚ پێغەمبەر ﷺ هەر دەگەڕێتەوە ئەوجا دەست و قاچی ئەو کەسانە دەبڕیٚ کە دەیان وت وەفاتی کردووە.

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت:ئەبو بەکر تەنها کەس بوو کە بە هێمنی مابووەوە وتێك نەچووبوو،لەسەر خۆ هاتە مزگەوت و سەیری کرد عومەر وەك شێتی لیٚ هاتووە و بە هەر چوار لادا هاوار دەکات و هەڕەشە دەکات و دەڵێت: هەر کەس بڵیٚ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە بەم شمشێرە دەیکوژم.

ئەبو بەکر رضي الله عنه زۆر گویٚی نەدا بە قسەکانی عومەر رضي الله عنه و بەرەو ژوورەکەی عائشە رۆشت، کە چووە ژوورەوە سەیری کرد جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لە لایەکی ژورەکەدا دانراوەو پارچەیەك قوماشی بەسەرەوەیە، لە جەستەی پیرۆزی نزیك بۆوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دایك و باوکم بەقوربات بێت،ئەمەیە ئەو مردنەی کە خوا لەسەری نوسیبویت،ئەوا ئێستا چەشتت،دوای ئێستا چیدی مردن نییە. پاشان سەری نزیك کردەوە لە سەری پیرۆزی و قوماشە بوردەکەی سەری لادا و دانەوییەوە و ماچی نێوچاوانی کرد و وتی:ئای بۆ حاڵی پێغەمبەرەکەم... ئای بۆ حاڵی پێغەمبەری موختار،

ئای بۆ حاڵی خۆشەویستەکەم،لەگەڵ هەر ئاهێکدا ماچێکی دەکرد... پاشان بوردەکەی سەری دادایەوە و و چووە دەرەوە و سەیری کرد عومەر ﷺ هەر بەردەوامە و هاوار دەکات: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە و ناشمرێت هەتا دووڕووان لەناو دەبات.

ئەبو بەکر , له عومەر ﷺ چووە پێشەوە و پێی گوت:عومەر لەسەر خۆبە، بێدەنگ بە،عومەر هەر بێدەنگ نەدەبوو، که زانی گوێی بۆ ناگیرێ،ئینجا رووی کردە خەڵکەکە و دەستی کرد بە وتار خوێندن،کە خەڵکەکە ئەبو بەکریان بینی قسەی دەکرد وازیان له عومەر هێنا لە دەوری ئەبو بەکر خڕ بوونەوە،ئەبوبەکریش لە پاڵ مینیەرەکەی پێغەمبەردا وەستا نەچووە سەرەوە،بانگی کرد له خەڵکەکە و داوای لێ کردن دانیشن و گوێی بۆ بگرن.. خەڵکەکە هەموو دانیشتن... ئینجا حەمد و سەنای خوای کرد و سەڵەواتی لەسەر دیداری پێغەمبەر داو وتی:خەڵکینە خوا بۆ خۆی پرسەی پێغەمبەرەکەی دەکات،ئەو زیندووە و هەرگیز نامرێت، بە ئێوەشی وتووە کە هەمووتان دەمرن و کەستان لەم زەوییەدا رۆح دەر ناکەن و تەنها خوا نەبێت هەمووی لەناو دەچێت، خوای گەورە تەمەنی پێغەمبەکەی درێژ کرد هەتاوەکو دینی خوای پێ بەرز کرد و فەرمانی خوای بە قەرار کرد و ریسالەتی ئەوی گەیاند و لە پێناویدا جیهادی و خەباتی بەردەوامی کرد،هەتا ئەمڕۆ کۆتایی تەمەنی هات و وەفاتی کرد،ئێستاش ئێوەی لەسەر ڕێبازی ڕاستی بەجێ هێشتووە و هەر کەسێك لێی لابدات تێدا دەچێت و خۆی زیانی پێ دەگات،هەر کەسێك لە ئێوە ئەگەر خوای پەرستووە ئەوا خوای مەزن ماوە و ناشمرێت،هەر کەسێك (محمد)ی دەپەرست، ئەوا با چاك بزانێت کە (محمد) کۆتایی تەمەنی هات و وەفاتی کرد.

خەڵکینە لە خوا بترسن،دەست بە دینەکەتانەوە بگرن، پشت بە خوای خۆتان ببەستن،ئاینی خوا بەرقەرارە،

وتەکانی خوا تێر و تەواوە، خوا پشتیوانی ئەو کەسە دەکات کە پشتیوانی لە ئاینەکەی بکات و ئاینەکەی سەر بڵند بکات، خوا لەناوماندا ماوە، هەمووی نور و بەرەکەتە، لە ناویدا حەڵاڵ و حەرام ڕۆشنە. سوێند بە خوا هیچ باکمان نییە کێ خەڵقی دونیامان بۆ دێنێت،شمشێرەکانمان لە کێلان دەرهاتووە و هێشتا دامان نەناوە، جیهاد دەکەین لەگەڵ ئەو کەسەی دژ بە ئێمە دەوەستێتەوە، هەروەکو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا جیهادمان دەکرد و تێدەکۆشاین، با هیچ کەسێکیش خۆی نەڕەنجێنێت و زوڵم نەکات.

پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:( وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ )، واتە: (موحەمەد کەسێك نییە جگە لەوەی وەکو هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی هاتووە،ئایا ئەگەر وەفاتی کرد چۆن دەبێت ئێوە پشتاوپشت هەڵگەڕێنەوە، هەر کەسێك وا بکات ئەوا هیچ زیانێك بە خوای گەورە ناگەیەنێت و لە کۆتایشدا خوای گەورە پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە).

ئەبو هورەیرە دەڵێت:

سوێند بێت بە خوا خەڵکی وایان دەزانی ئەمە یەکەم جارە ئایەتی وەها هاتبێتە خوارەوە، هەموویان کش و مات ببوون دەنگیان لێوە نەدەهات، ئەوەی لە دەمی ئەبوبەکریان وەرگرت هەر دەیان وتەوە.

عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت: سوێند بێت بە خوا، هەرکە گوێم لێ بوو ئەبو بەکر ئەم ئایەتەی خوێندەوە، گیانم بەسەر یەکدا هەژا و ئەژنۆم شکاو و نەمتوانی بە پێوە بوەستم و کەوتم... ئینجا زانیم ڕاستە و پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کردووە...

لەو ڕۆژە پڕ لە خەم و پەژارەیەدا، کە جەستە و گیانی پیرۆزی گەورە ترین مرۆڤ تەسلیم بە ئەمری خوا بوو،هاوەڵان بە کوڵ گریان،فرمێسکیان ڕشت،یەکێك لەو شاعیرە هەست ناسکانەی کە هەمیشە شیعری بە باڵای جوانی ئیسلام و پێغەمبەردا دەوت ﷺ،(حەسانی کوڕی ثابت)بوو،کە ناسرابوو بە شاعرەکەی پێغەمبەر ﷺ،قەسیدەیەکی لاواندنەوەی لەو کاتەدا گوتووە بە دوور و درێژی لە کتێبەکانی سیرەدا نوسراونەتەوە،ئەمەش چەند دێڕێکیەتی:

ورا‌حـــوا بحــزن لیـــس فیهم نــبـیــهم

وقـــد وهـــنـــت منهم ظهور وأعـضد

یـبـکـون مـــن تـبـکـــي الـسمـوات یومه

ومـــن قـــد بکــــته الأرض فالناس أکمد

واتە: ئەوەتا هاوەڵان لە خەمی ئەوەدا کە پێغەمبەرەکەیان لە نێوانیاندا نەماوە،تیایاندا هەیە پشتی لاواز بووە و هەندێکیشیانی دەست و باسکەکانی، بۆ ئەو کەسە دەگرین کە ئاسمانەکانیش شینی ئەو ڕۆژە دەکەن، هەروەها ئەو کەسەی کە زەمین بۆی دەگری و مرۆڤەکانیش قار و خەفەتی پێ دەخۆن.



یەکێکی تر لەو هاوەڵانە (بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی)بوو،ئەم پیاوە خۆشەویستە بانگدەری پێغەمبەر بوو ﷺ،لە ژیاندا لە خزمەت پێغەمبەردا زۆر بانگی دابوو،دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺوەفاتی کرد، لە سەردەمی خیلافەتی ئەبو بەکردا،وتیان: هەستە کاتی نوێژە بانگێکمان بۆ بفەرموو.

(بیلال)یش هەستا و دەستی پێ کرد گەیشتە (أشهد أن محمدا رسول الله)، لەوێدا بینی گیرا و گریان مۆڵەتی پێنەدا بانگەکەی تەواو بکە،بە هێواشی بڕییەوە و چیتر بڕیاری دا بانگ نەدات.

پاشان بۆ جیهاد بەرەو شام کەوتە ڕێ، کاتێك موسڵمانان فەتحی فەڵەستینیان کرد،میری موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب، خۆی ئامادە بوو بۆ کردنەوەی شاری قودس بە دەستی خۆی.

لەوێدا بێ ئەوەی کەس پێی بڵێت بیلال خۆی هەستا و بانگی دا،هەرچی هاوەڵان لەوێدا بوون دایانە پرمەی گریان و پەرێشان بوون،چونکە بانگەکەی بیلال ڕۆژگارەکانی پێغەمبەری ﷺ وەبیر هێنانەوە، لە دواجاریشدا بیلال گەڕایەوە شاری مەدینە و بۆ دواجار لەوێ بانگی فەرموو،بەڵام ئەمجارە لەگەڵ گریانی بیلالدا شارێك بە خەڵك و دار و درەخت و کوچە و کۆڵانەکانەوە لەگەڵیدا بە کوڵ گریان.

# گرنگترین سەرچاوەکانی نوسەر

١. المغازي:

نوسینی: موحەمەدی کوڕی عومەری واقیدی، لە ساڵی ٢٠٧ ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، توێژینەوەی دکتۆر : مارسیدن جۆنز، چاپی زانکۆی ئۆکسفۆرد / ١٩٩٦ زاینی.

٢. السيرة النبوية :

نوسینی:ئەبو موحەمەد عەبدولمەلیك کوڕی هیشام کوڕی ئەییوبی حومەیری،لە ساڵی ٢١٦ی کۆچیدا مردووە،توێژینەوەی مامۆستا مستەفا سەقا،بە هاوکاری چەند نوسەرێکی تر، چاپخانەی (مستەفا بابی) قاهیرە، ١٣٥٥ی کۆچی بەرامبەر بە ١٩٣٦ی زاینی.

٣. الطبقات الكبير :

نوسینی موحەمەدی کوڕی سەعدی لەیثی،لە ساڵی ٢٣٠ی کۆچیدا وەفاتی کردووە،چاپی (لایدن) ساڵی ١٣٢٢ کۆچی.

٤. المسند :

نوسینی ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەلی شیبانی، لە ساڵی ٢٤١ ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، ڕاڤە کردنی: ئەحمەد موحەمەد شاکر،چاپی (دار المصارف)میسر، ١٣٦٩ ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩٥٠)ی زاینی.

٥. صحيح البخاري:

نوسینی: ئیمام ئەبو عەبدولاّ موحەمەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری، لە ساڵی ٢٥٦ی کۆچی وەفاتی کردووە،چاپخانەی (موحەمەد عەلی سەبح)مێژووی نییە.

٦. تأريخ الرسل و الملوك:

نوسینی:ئەبو جەعفەری موحەمەدی کوڕی جەریری طەبەری،لە ساڵی ٣٢٠ کۆچی دوایی کردووە،، چاپی ١٨٨١ زاینی.

٧. البدء و التأريخ:

نوسینی: موطەههەری کوڕی طاهیری مەقدیسی، لە ساڵی ٣٥٥ ی کۆچیدا وەفاتی کردووە،ساڵی چاپ ١٨٩٩ زاینی، پاریس.

٨. المستدرك على الصحيحين:

نوسینی: ئەبو عەبدوڵای موحەمەد کوڕی عەبدوڵای ناسرا و بە حاکمی نیسابووری، ساڵی ٤٠٥ی کۆچی وەفاتی کردووە، چاپی (ریاض)چاپخانەی (النصر) ساڵی ١٩٦٨ زاینی.

٩. حلية الأولياء وطبقات الأصفياء:

نوسینی :حافظ ئەبو نەعیم ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵای ئەصبەهانی، ساڵ ٤٣٠ کۆچی وەفاتی کردووە، چاپی قاهیرە ١٣٥١ کۆچی،١٩٣٢زاهینی.

١٠. الأستيعاب في معرفة الأصحاب:

نوسینی: حافظ ئەبو عومەر یوسفی کوڕی عەبدوڵا کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدولبەڕ،لە ساڵی ٤٦٣ی کۆچی وەفاتی کردووە، توێژینەوەی (عەلی موحەمەد ئەلبەجاوی) چاپخانەی (النهضة)میسڕ- قاهیرە.

١١. الروض الأنف :

نوسینی: ئەبو قاسم عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵای سوهەیلی،لە ساڵی ٥٨١ی کۆچیدا وەفاتی کردووە،چاپخانەی (قاهیرە) ١٣٣٢ کۆچی، ١٩١٤ ی کۆچی.

١٢. صفة الصفوة :

نوسینی: حافظ ئەبولفەرەج عەبدوڕەحمانی کوڕی عەلی (إبن الجوزي)،ساڵی ٥٩٧کۆچی دوایی کردووە، چاپی حەیدەر ئاباد ١٣٥٥ ی کۆچی.

١٣. الكامل في التأريخ:

نوسینی: عیزەدین عەلی کوڕی محمد، ناسراو بە (إبن الأثير)، لە ساڵ ٦٣٠ی کۆچی وەفاتی کردووە، چاپی بەیروت ١٣٨٥ ی کۆچی ١٩٦٥ ی زاینی.

١٤. أسد الغابة في حياة الصحابة:

نوسینی: عیزەدین عەلی کوڕی محمد، ناسراو بە (إبن الأثیر)، لە سالّ ٦٣٠ی کۆچی وەفاتی کردووە،چاپی قاهیرە ١٢٨٠ کۆچی.

١٥. مختصر صحیح المسلم:

نوسینی: حافظ زکی الدین المنذري ساڵی ٦٥٦ ی کۆچی وەفاتی کردووە، توێژیتەوەی: شێخ موحەمەدناصرەدینی ئەلبانی، چاپی کوەیت، ١٣٨٨ کۆچی، ١٩٩٦ زاینی.

١٦. البدایة و النهایة:

نوسینی: ئەبولفیداء ئیسماعیلی کوڕیٚ (کثیر)ی قورەیشی دیمەشقی، ساڵی ٧٧٤ی کۆچی وەفاتی کردووە، چاپی قاهیرە ١٣٨٤ ی کۆچی ١٩٦٤ زاینی.

١٧. إمتاع الآسماء بما للرسول من أبیاء و الأموال و الحفدة و المتاع:

نوسینی: تەقیەدین ئەحمەدی کوڕی عەلی مەقریری، ساڵی ٨٤٥ ی کۆچی وەفاتی کردووە.

١٨. الأصابة في تمییز الصحابة:

نوسینی: حافظ ئەبولفەزڵ ئەحمەدی کوڕی عەلی – ناسراو بە (إبن الحجر العسقلاني)–،ساڵی ٨٥٢ ی کۆچی وەفاتی کردووە،چاپی قاهیرە ١٣٢٥ی کۆچی ١٩٠٧ ی زاییني

١٩. بهجة الحافل وبغیة الأماثل:

نوسینی شێخ عیمادەدین یەحیای کوڕی ئەبو بەکری عامری، ساڵی ٨٨٥ی کۆچی وەفاتی کردووە، چاپی قاهیرە ١٣٣٠ ی کۆچی.

٢٠. التحفة اللطیفة في تارخ المیدنة الشریفة:

نوسینی:حافظ شەمسەدین سەخاوی، ساڵی ٩٠٢ی کۆچی وەفاتی کردووە،چاپی قاهیرە ١٩٥٦ی زاینی.

٢١. وفاء الوفا بأخبار دار المصطفی:

نوسینی: جەمالەدین ئەبولمەحاسین عەبدوڵای کوڕی شەهابی سەمهوودی، ساڵی٩١١ وەفاتی کردووە،چاپی قاهیرە ساڵی ١٣٢٦ی کۆچی.

٢٢. الخصائس الكبرى أو كفاية الطالب اللبيب في خصائص الحبيب:
نوسينى: حافظ جەلالەدین عەبدوڕەحمانی سیوطي،ساڵی ٩١١ی کۆچی وەفاتی کردووە،توێژینەوەی دکتۆر: موحەمەد خەلیل هەراس،چاپی قاهیرە، ١٣٨٦ کۆچی-١٩٦٧ی زاینی.
٢٣. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم و السبع من المثاني:
نوسینی: ئەبو سەناو شەهابەدین کوڕی عەبدوڵای ئالوسی بەغدادی، ساڵی ١٢٧٠ی کۆچی وەفاتی کردووە،چاپی (منيرية).
٢٤. دیوانی حسّان بن ثابت الأنصاري:
ڕاڤەکردنی:عەبدوڕەحمانی بەرقوقی، چاپی قاهیرە (رحمانیه)١٣٤٧ ی کۆچی، ١٩٢٩ی زاییني.
٢٥. أعلام النساء:
نوسینی: عمر ڕەزا کەحالە، چاپی دیمەق (الهاشمیه)١٣٧٧ی کۆچی.

